# ڕەوتی فەلسەفە لە ئێران




**محەمەد ئیقبال لاهووری**

و. فارسی: ا.ح. ئاریان پوور

و.کوردی: بەیان عەزیزی





لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری
زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
(٣٧)

٢٠١٦

# ڕەوتی فەلسەفە لە ئێراندا

.................................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٣٧)

- نووسینی: محەمەد ئیقبال لاهووری
- وەرگێڕانی: بەیان عەزیزی
- بابەت: فەلسەفە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپی یەکەم: چاپخانەی شڤان

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٢٦٥)ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە

## پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی
## ئەرکی چاپکردنی ئەم کتێبەی لە ئەستۆگرتووە




پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك - ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات: فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیریی و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا..

**ناوەرۆك**

# پێشەکی

بەرچاوترین و دیارترین ئیمتیازی مەعنەوی خەڵکی ئێران خوازیاریی ئەوانە بۆ هزر و فەلسەفە، لەهەمانکاتدا هەر توێژەرێک کە بیەوێت ئەو دەزگا و سیستمە فکرییە گشتگیرانە بدۆزێتەوە کە لە ناو کتێبە بەجێماوەکانی ئێراندایە، تووشی نارەزایەتی دەبێت، هەرچەند تا رادەیەکی زۆر دەچێتە ژێر کاریگەریی ئەو نەرم و نیانییە سەیرەی فکری ئێرانییەوە، بەڵام لەگەڵ سیستمێکی وەک دەزگای کاپیلا (Kapila) ی هیندی یان سیستمی کانتی ئەڵمانیدا رووبەڕوو نابێتەوە، وادێتە بەرچاو کە زەینی ئێرانی بەرامبەر بە وردەکارییە فکرییەکان بێ سەبرە، بەڵام توانای ئەوەی نییە کە لە دیتنی واقعە پرژ و بڵاوەکانەوە خۆی بگەیەنێتە بنەما گشتییەکان و بتوانێت سیستمە فکرییە دەوراندەوریەکان رێک بخات. برەهمەن، ئەو ناسک خەیاڵە هیندیە دەستی دەگاتە تاکایەتی ناوەکی جیهان، تاکی ئێرانیش وادەکات، بەڵام برەهمەنی هیندی هەوڵ دەدات کە تیشکی ئەم تاکایەتییە گشتییە لە هەموو ئەزموونە وردەکانی ژیاندا بدۆزێتەوە و لە روخسارە جیاوازەکانی بووندا بیانبینێت، لەحاڵێکدا کە تاکی ئێرانی تەنها بە وەرگرتنی گشتییەتی ئەم تاکایەتییە دڵخۆشە و بۆ هەڵسەنگاندنی قووڵایی و بەربڵاویەکەی هیچ هەوڵێک نادات. زەینی ئێرانی وەک پەپوولەیەکی سەرخۆش لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێکیتر دەفرێ و بە رواڵەت هیچ کاتێک لە روخساری گشتی باخەکە تێناگات، لێرەدایە کە قووڵترین فکر و عاتیفەکانی

خەڵکی ئێران لە بەیتگەلێکی بڵاودا کە ناوی غەزەلی لێنراوە و پیشاندەری رۆحی هونەری ئەوانە، خۆی دەنوێنێت، هیندییەکان لەهەمانکاتدا کە وەک ئێرانییەکان زانستێکی گشتگیر و بەرز بەپێویست دەزانن، ئارام ئارام لە تاقیکردنەوەیەکەوە بۆ ئەزموونێکیتر دەڕۆن و بە هەوڵدانی زۆر نمودەکان هەڵدەکۆڵن و دەگەنە دیسیپلینێکی گشتی کە لە ناخی نمودەکاندا شاراوەیە، تاکی ئێرانی فەلسەفە وەک سیستمێکی گشتگیر ناخاتە بەرچاو، بەڵام برا هیندیەکەی باش دەزانێت کە دەبێ فەلسەفەی خۆی بە شێوازی سیستمێکی هەڵسەنگێنراو ساز بکات.

ئەنجامی دیاری نایەکسانی زەینی ئێرانیەکان و هیندییەکان ئەوەیە کە لە ئێراندا تەنها سیستمە فکریە ناتەواوەکان وەدی دێت و لە هیند سیستمگەلێکی گەورە وەکو دان تا Vedanta دێتە کایەوە، هەربۆیە کەسێک کە بیەوێت لە بواری عیرفانی ئیسلامییدا تویژینەوە بکات و تەرحێکی گشتگیر سەبارەت بە بنەمای یەکگرتن دەستبخات ناچاردەبێ کە روو لە کتێبە ئێرانییەکان هەڵگەڕێنەتەوە و ئاوڕ بداتەوە لە ئاسەوارەکانی حەکیمی ئەندەلوسی (ابن عربی) کە فێرکارییە قووڵەکەی لەگەڵ ئیسلامی وشکی هاونیشتمانیەکانیدا زۆر دژکارە.

لە مێژووی فکری ئێرانییدا بارودۆخێکی تایبەت لە ئارادایە، عەقڵانیەتی فەلسەفی ئێران رەنگە بەهۆی دزەکردنی فەرهەنگە سامیەکان، زۆر ئاوێتەی ئایین بووبێ، بیرمەندە نوێخوازەکان بەردەوام داڕێژەرانی بزووتنەوە ئایینیەکانیش بوون،. پاش زاڵبوونی عەرەب بەسەر ئێراندا فەیلەسووفە نوێ ئەفلاتوونی و ئەرەستۆییەکانی ئێران بەشێوازێکی کاتی فەلسەفەی پەتییان لە ئایین جیا کردەوە، ئەم جوداییە زۆر کورتخایەن بوو، فەلسەفەی یۆنانی هەرچەند ئێرانی نەبوو، بەڵام بووە بەشی جیانەکراوەی فکری ئێرانی، حەکیمەکانی دوایی چ ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی بوون و چ ئەوانەی کە بە رەخنەگرتنی وردەوە سەیریان دەکرد، هەموویان بە زمانی

ئەفلاتوون یان ئەرەستۆ دەدوان، بەم حاڵەوە بۆ تێگەیشتن لە فەلسەفەی ئیسلامی دەبێ بیرمان نەچێت کە زۆربەی حەکیمەکان وابەستەی ئایین بوون.

ئەم نامیلکەیەی لە بەردەستدایە، هەوڵێکە بۆ ڕێگەخۆشکردنی بواری مێژووی فەلسەفە لە ئێراندا، بێگومان ناکرێ چاوەڕوانی داهێنان و دۆزینەوەی شتی تازە بین لە وەها لێکدانەوەیەکی مێژووییدا، بەڵام دوو خاڵی گرنگ لەم باسە بەدەست دەهێنین:

أـ ڕەوت و بەردەوامیی لۆژیکی فکری ئێرانی بە زمانی فەلسەفەی ئەمڕۆیەوە باسکراوە و تا ئەو شوێنەی کە من بزانم، وەها کارێک پێشتر نەکراوە.

ب ـ بابەتی تەسەووف بەشێوەیەکی زانستی خراوەتە بەر لێکدانەوە و باس لە بارودۆخی دەرکەوتنی کراوە. بە ڕای من بەپێچەوانەی باوەڕی باو، تەسەووف لە ئاوێتەبوونی هێزە عەقڵی و ئەخلاقییە جیاوازەکان سازکرا و ئەو هێزانەش بە ئیجبار ڕۆحی خەوتووی مرۆییان هەڵساند و بەرەو ئامانجە بەرزەکان ڕۆیشتن.

لەبەرئەوەی کە زانیارییم لەسەر زمانە ئێرانییە کۆنەکان نییە، ئەو باسەی کە لە بەشی سەرەتای نامیلکەکەدا سەبارەت بە زەردەشت نووسیومە، زانیاری گەلێکن کە بە واسیتەوە دەستم کەوتووە، بەڵام لە بابەتەکانی بەشی دووهەمدا، لەوانەدا ڕاستەوخۆ گەڕاومەتە سەر دەستنووسە ڕەسەنە فارسی و عەرەبیەکان و گەلێک کتێبی چاپییم خوێندووەتەوە. سەرچاوە ڕەسەنەکانی من ئاوەهان:

١. تأريخ الحكماء، بەرهەمی بیهقی.
٢. شرح أنواريه، بەرهەمی محمد شريف هروی.
٣. حكمه العين، بەرهەمی نجم الدين علی دبيران كاتبی.
٤. شرح حكمه العين، بەرهەمی شمس الدين محمد مبارک.
٥. شرح حكمه الدين، بەرهەمی محمد هاشم حسينی.
٦. عوارف المعارف، بەرهەمی ابوحفص عمر سهروردی.
٧. مشكوه الانوار، بەرهەمی ابو حامد محمد غزالی.
٨. كشف المحجوب، بەرهەمی ابوالحسن علی هجويری.
٩. رساله نفس ارسطو، وەرگێڕانی افضل الدين كاشانی.
١٠. رساله، بەرهەمی مير سيد شريف علی جرجانی.
١١. خاتمه، بەرهەمی سيد محمد گيسو دراز.
١٢. منازل السائرين، بەرهەمی عبدالله اسماعيل هروی .
١٣. جاويدان نامه، بەرهەمی افضل الدين كاشانی.
١٤. تأريخ الحكماء، بەرهەمی شمس الدين محمد شهرزوری.
١٥. مجموع آثار، بەرهەمی ابو علی حسين سينا.
١٦. رساله فی الوجود، بەرهەمی مير سيد شريف علی جرجانی.
١٧. جاويدان كبير، اثر ابوالفضل استرآبادی.
١٨. جام جهان نما[١] .
١٩. مقصد اقصی، بەرهەمی عزيز بن محمد نسفی.

[1] محمد اقبال لاهوری ناوی خاوەنی ئەم كتێبەی نەنووسیوە و لە دەقەكەشدا بە هیچ شێوە ئاماژەی بەوە نەداوە. لە ناو كتێبە ئامادە فارسییەكاندا چەند بەرهەم هەر بەم ناوە بوونی هەیە. لەوە دەچێت كە مەبەستی نووسەر، جام جهان نما، بەرهەمی مير غياث الدين منصور دشتكی بێت.

# بەشی یەکەم
# دووالیزمی ئێرانی

## ١. زەردەشت

لە مێژووی ئەندێشەی ئاریاییە ئێرانیەکاندا، یەکەمین پێگە تایبەتە بە زەردەشت، حەکیمی ئێرانی کەون ئارا، ئەو سەردەمەی کە لە دەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاستدا سرووودە وەداییەکان دادەڕێژران، ئاریاییەکانی ئێران کە لە گەڕان و کۆچی بەردەوام وەڕەز بووبوون، شانیان خستە ژێر باری شێوە ژیانی نیشتەجێبوون و دەستیان کرد بە کشتوکاڵ.

ئەم شێوە ژیانەی کشتوکاڵی و بەتایبەت سەقامگیربوونی بنەمای خاوەندارێتی ئەوانی خستە بەر ڕقی دیکەی هۆزە ئاریاییەکان، کە هێشتا ژیانی کۆچاوکۆچیان تەرک نەکردبوو، ئەو هۆزانە جاروبارێک دەستیان دەکرد بە تالانکردنی خان وماڵی خزم و کەسەکانیان کە بووبوونە شارستانی و شارنشین، ئەو دژوارییەی کە لە نێوان ژیانی نیشتەجێبوون و ماڵ لەکۆڵیدا هەبوو، ئاریاییە ئێرانی و غەیرە ئیرانییەکانی تووشی ناکۆکی و شەڕ کرد، یەکەمین دەرکەوتەی ئەم شەڕە دابەشکردنی خواوەندە ئاریاییەکان بوو بەسەر (دەواکان و ئەهووراکان)دا.

هەرکام لەم دوو لقە، ئاریاییەکان بەشێک لە خواکانیان تایبەت کردبوو بۆ خۆیان و بەشەکەیتریان وەلا نابوو، بەمشێوە بوو کە جیابوونەوەی ئاریاییەکان دەستی پێکرد و بەرەبەرە گەیشتە سەربەخۆیی ئاریاییە ئێرانییەکان و دەرکەوتنی سیستەمی ئاینی زەردەشت، ئەو پێغەمبەرە گەورەی کە لە سەردەمی سۆلۆن و تالێس دا دەژیا.

لە ژێر تیشکی روژهەلاتناسیی ئێستادا، ئێرانییەکانی کەون ئارا دەبینین کە لە کاتی دەرکەوتنی زەردەشتدا دابەش بوون بە سەر دوو باڵدا:

پەیڕەوەکانی هێزە باشە خۆییەکان و لایەنگرانی هێزە خراپە دەرەکییەکان. زەردەشتیش هەنگاو دەنێتە ناو ئەم مەیدانە شەڕە و بە وزەی ئەخلاقی خۆیەوە، پەرستنی دێوە دەرەکیەکان بێ نرخ دەکات و داب و نەریتە دژوارەکانی کاهینەکانی مۆغ لە ڕەواج دەخات.

هەڵسەنگاندنی ژێدەر و گەشەی سیستمی ئایینی زەردەشت لەم باسەی ئێمەدا ناگونجێت. کاری ئێمەش لێکۆڵینەوەیەکی کورتە سەبارەت بە لایەنی فەلسەفی ئەم ئاینە. کەواتە سیستمی ئایینی زەردەشت تەنها لە باری تەسلیسی بە نرخی فەلسەفە واتە سێ بابەتی خوا و مرۆڤ و سرووشت، دەخەینە بەرچاو.

گایگەر لە کتێبی شارستانیەتی ئێرانییە ڕۆژهەڵاتییەکان لە سەردەمی کەون ئارادا، ئاماژە بەوە دەکات کە زەردەشت دوو بنەمای بناغەیی لە ئارياییە پێشووەکانەوە بە میرات پێ گەیشتووە:

**١. یاسای زاتیی، سرووشتە.**

**٢. پێکدادان لە ناو زاتی سرووشتدایە.**

زەردەشت لە ئاوێنەی گشت نمای جیهاندا یاسا و پێکدادانی بینی و بناغەی فەلسەفی سیستەمەکەی خۆی لە سەر ئەم دوو بنەمایە دامەزراند. ئەو بابەتەی کە ئەوی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، ئاشتکردنەوەی خراپە لەگەڵ باشی جاویدانی خودادا بوو. پێشینەکانیان ژمارەیەک ئەرواحی باشیان دەپەرست. زەردەشت هەموو ئەو ئەرواحەی کرد بە یەک و ئەو یەکەشی ناونا "ئەهوورا مەزدا". هەر بەم شێوەش هەموو ڕۆحە خراپەکانی کرد بە یەک و ناوی لێنان "دروج- ئەهریمەن"، کەواتە زەردەشت گەیشتە دوو بنچینە یان بناغە، بەڵام بەو شێوەی کە هاگ نووسیویەتی، ئەو دوو بنچینەیەی جیهانی بە دوو هێز یان دوو چالاکی سەربەخۆ نەزانی. زەردەشت ئەوانەی بە بەهرەکان یان روخساری دووانەی یەک وجوودی

تاقانە زانی. لێرەوەیە کە بە باوەڕی "هاگ" پێغەمبەری ئێرانی کەون ئارا لە باری ئایینییەوە تاقە خواپەرستە و لە باری فەلسەفییەوە دووالیستە. (١)

بەڵام ئەگەر بڕوامان بە دوو رۆح هەبێت(٢)- رۆحی خوڵقێنەری بوون و رۆحی خوڵقێنەری نەبوون- و باوەڕمان بەوە هەبێت کە ئەم دووانە لەیەک وجودی متعالدا پێکەوە پەیوەندییان دەبێت و دەبنە یەک(٣)، ناچار دەبین کە بنەمای خراپەش بە زاتێکی خوا بزانین، لەم کاتەدایە کە پێکدادانی چاکە و خراپە بە شەڕی خوا لەگەڵ خۆیدا دەبیندرێت و دەبێ ئەوە قبووڵ بکەین کە تێکۆشانی زەردەشت بۆ ئاشتکردنەوەی تەوحیدی ئایینی لەگەڵ دووالیزمی فەلسەفییدا ئاڵۆز بوو، هەر ئەم ئاڵۆزییەش بوو کە جیایی خستە نێوان پەیڕەوەکانییەوە.

کە زەردەشت کۆچی دوایی کرد لە نێوان پەیڕەوەکانیدا چەند فیرقە درووست بوو، یەکێک لەوانە فیرقەی زەندیەکان بوون، "هاگ" ئەم فیرقەیە لە چاو رێنموونیەکانی زەردەشت بە لادەر و مورتەد دەزانێت، بەڵام بە باوەڕی من بڕوای زەندیەکان رەسەنتر و سازگارترە لە بڕوای دژکارەکانیان، ئەم فیرقەیە ئەوەی راگەیاند کە ئەرواحی دووانە لە یەکتر جیا و سەربەخۆن، بەڵام فیرقەی دژکار واتە فیرقەی موغان باسی لە یەکبوونی ئەرواحە دووانەکان کرد، یەکیەتی خوازەکان لە رێگەی جیاوازەوە لەگەڵ زەندیکان دژایەتییان کرد، بەڵام لە بەرامبەر دەنگی پتەوی زەندیەکان کەوتنە لەرزین، ئەم بابەتە لە رووی بیچم و راڤە جیاوازەکان دەردەکەوێت کە بۆ باسکردن لە یەکیەتی دوو بنەمای

---

[1] M.Haug:Essay on the Sacred Language,Writings and Religion of the Parses ,1862,p.303

[2] لە سەرەتادا هەردووکیان دوو رۆح بوون و هەرکامیان کردەوەی تایبەتی خۆیان هەبوو. یەسنا، ٣٠، ١.

[3] لە دوو رۆحەکەی من، ئەوەیان کە باشترە گشت خوڵقانی قودسی بە کەلام بەرهەم هێناوە. هەرئەوە، ٢٩.٩.

ســـەرەتایی بەکاریـــان دەبـــرد، هەنـــدێک لە تەعبیـــر و روونکـــردنەوە ناســازگارەکانی موغەکــان لە نــاو کتێبــی (ابــو الفــتح تــاج الــدین محمــد شهرســتانی)دا هــاتووە.[1] چەنـد فیـرقەی دیـکەش هـاتن و تیۆرییـان لەگەڵ خۆیاندا هێنا، زەروانییان رووناکی و تاریکیاییـان بە رۆڵەکانی زەمەنـی بێ کۆتــایی نــاوبرد، کیۆمەرســییەکان وتیــان کە بنەمــای ســەرەتایی جیهــان، رووناکی بووە، بەڵام رووناکی لە هێزی دوژمنایەتی ترسـا و لەم تـرس و دوژمنییە تاریکایی پەیدا بوو، یەکێک لە لقەکانی فیرقەی زەروانـی لەسـەر ئەو بـاوەڕە بـوو کە بنەمـای ســەرەتایی تووشــی شـک و گومـان بـوو و ئەهریمەن لەو سکەوە پەیدا بوو. (ابن حزم) ناوی فیرقەیەکی تـر دەبـات کە ئەم فیرقەیە رووناکی بە بنەما و تاریکی بە بەرهەمی لە ناوچوونی بەشێک لە رووناکی دەزانێت.

دووالیزمـی فەلسـەفی و تەوحیـدی زەردەشـت رەنـگە ئاشـتییان ببێـتەوە و رەنگە وانەبێت، بەڵام ئەم خاڵە بێ ئەمـلاولایە کە زەردەشـت توانی سـەبارەت بە زاتی کۆتایی جیهان باسێکی فەلسـەفی قووڵی ئاراسـتە بکات و وادیارە کە توانی بچێتە نـاو فەلسـەفەی سـەردەمی دوای خۆی، فەلسـەفەی یۆنـانی کەون ئارا بەهرەی لە باسەکەی ئەو وەرگرت نوستیکە عارف کرداره مەسـیحییەکان لە کــاریگەریەتی ئەو بەدوور نەبــوون و تەنــانەت ئەم کاریگەریەتییەشــیان گەیاندە هەندێک لە سیستمە فەلسـەفییەکانی رۆژئاوای زەوی.[2]

---

[1] ابو الفتح تاج الدین محمد شهرستانی، الملل والنحل، کورتەن، لەندەن ١٨٤٦، ل ١٨٢-١٨٥

[2] ئەردەمـان سـەبارەت بە نفـووزکردنی چەمـکە زەردەشـتیەکان لە نـاو فەلـسەفەی ئۆنانـدا ئاوەهای نووسیوە: هراکلیتووس ئەم هێزە بە توخمی گشت رووداوەکان و میزانی دیسیپلینی عالەم دەزانێت. ئەم بابەتە کە بە هێزی شـوعلە نـاوی براوە لە دایکبووی نفووزی موغەکانی ئێـرانە، لە لایەکیتـرەوە هراکلیتـوس، ئـاپۆلۆن و دیۆنۆسـۆس لە لای زیـۆس دادەنیـت و ئەو دووانە بە لایەنە دووانەکانی زاتی زئۆس دەزانێت. ئەم کارەی ئەو پێویستی بە دەستبردنە ناو ئۆستوورە یۆنانیەکانە.

لارنس میلز، نفووزی زەردەشت لە هراکلیتوس بەئەستەم نازانێت و هەر بەبۆنەی ئەم نفوزە شیمانەییەیە کە لاسال، زەردەشت بە پێشەنگی هیگێل دەزانێت. ئەردەمان سەبارەت بە نفوزی

زەردەشـــت وەک حەکیمێـــک شایـــستەی ڕێـــز و حـــورمەتگرتنێکی زۆرە، لەبەرئەوەی نەک تەنها بە ڕۆحێکی فەلسەفییەوە دەیڕوانییە زۆریی جیهانێکی عەینـــی، بەڵکـــو هەوڵێـــدا کە دووالیـــزم لە یەکبـــوونێکی بەرزدا بتـــوێنێتەوە، زەردەشت هەروەک پینەچییەکی عارف کرداری ئەڵمانی کە چەندین سـەدە لە دوای ئەو دەژیا، بەوەی زانی کە هەرگیز ناکرێ جیاوازی سرووشت روون بکـرێتەوە مەگەر ئەوەی کە هێزێکـی نەفـی کەرەوە و دژایەتـیکەر پەیوەسـت بکرێت بە خواوە، جێگرەکانی کە بەدواییدا هـاتن، باش درکیان بە بایەخی ئەم وانەی مامۆستاکەیان نەکرد و زۆری بەسەردا چوو کە بوارێکی شیاو پێکهات و بـابەتەکەی زەردەشـت بە مەعنەویـاتێکی زۆرتـرەوە لە هەنـدێک لە گەڕیـانە فیکرییەکانی ئێراندا ڕەنگی دایەوە.

زەردەشـت لە بـواری جیهانناسییـشدا بەپێـی دووالیزمـی تـایبەتی خـۆی، ڕاستەقینەکانی سـەرانسـەر دابەش کردە سـەر دوو بەش: بـوون کە بریتـی بـوو لە کۆی بەرهەمە باشەکان کە لە هەوڵی داهێنەرانەی ڕۆحی چاکخواز پێکدێت و نەبوون یان کۆی بەرهەمە خراپەکان کە لە ڕۆحی خراپەوە دەبێت.[1]

شـەڕی بنەڕەتـی ئەرواح دووانەکـان هەمـوو هێزەکـانی جیهـان تووشـی دژایەتی و پێکدادان دەکات و سرووشت دەبێتە مەیدانی شەڕی بەردەوامـی چـاکە و خـراپە، بەڵام لە نێـوان ئەرواحـی دووانە و بەرهەمەکانیانـدا هـیچ جۆرە ناوبژیوانێک لە ئارادا نییە، شتەکان لە خۆیانەوە باش یان خراپ نین؛

زەردەشـت لەسـەر فیساغۆرەس دەڵێ: فیساغۆرەس ژمارە تاکەکان بە سـەرتر دەزانێت لە ژمارە جووتەکان و گلادیش لە قیاسکردنی نێوان مەزهەبی فیساغۆرەسی لەگەڵ چینییەکاندا ئەم خاڵەی لەبەرچاو گرتووە. هەروەها فیساغیرەس لە باسکردن سەبارەت بە دژایەتییەکان، ئامـاژەی بە دژایەتـی نێـوان نـوور و زوڵـمەت و خێـر و شـەڕیش داوە. ئەم باسـە زۆرێک لە توێژەرە پێشوو و هەنووکەییەکانی هەژاندووە کە ئەم چەمکانە تایبەت بە ئایینی زەردەشت بزانن.

[1] نەبـوونی زەردەشــت نـابێ لەگەڵ لاوجـوودی ئەفلاتـوون بە یەکێـک بـزانین. بە بـاوەڕی زەردەشــت، گـشت روز سـارە وجوودیەکـان کە لە ڕۆحـی زوڵـمەتەوە دەبـن، بە نەبـوون دەژمێردرێن، لەبەر ئەوەی کە ڕۆحـی نـوور لە ئاکامـدا زاڵ دەبێت بەسـەر زوڵمەتدا، کەواتە بوونەوەرەکانی زوڵمەت لە بنەڕەتدا سەقامگیر نین.

چاکی و خراپی هەرشتێک دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکەی، بەمشێوەیە بوو کە زەردەشت سەبارەت بە خوڵقاندن تیۆرییەکی نوێی هێنایە ئاراوە کە لە باوەڕەکانی ئەفلاتوون و شۆپێنهاوێر دەچێت، بەڵام لەهەمانکاتیشدا تاقانەیە. بە باوەڕی ئەم دوو کەسە لە نێوان حەقیقەتە هەستپێکراوەکان و حەقیقەتە رەسەنەکان، چەند ناوبژیوانێک لە ئارادان: جیهانی بوون بە هۆی مۆسۆلەکانەوە کە لە سیستمی ئەفلاتوونیدا بابەتی غەیرە زەمەنی دەگرێتەوە و لە سیستمی شۆپێنهاوێردا بابەتی زەمەنین و ئەمانە پەیوەست دەدرێنەوە بە جیهانی نموودەوە.

بە باوەڕی زەردەشت بوون تەنها لە دوو بابەتدا دەگونجێت و مێژووی جیهان بریتییە لە بەیەکدادانی پۆزەتیڤی ئەو هێزانەی کە لەم دوو بابەتەوە سەرچاوە دەگرن، مرۆڤ وەک بوونەوەرەکانیتر لەم بەیەکدادانەدا بەشدارە، بەڵام بەرپرسە لەوەدا کە لایەنگری رووناکی بێت، لەبەرئەوەی کە رووناکی بەرحەقە و لە ئاکامدا رۆحی تاریکایی دادەپۆشێت و لەناوی دەبات. بەمشێوەیە فەلسەفەی گشتی پەیامهێنەری ئێرانی وەک فەلسەفەی گشتی ئەفلاتوون دەکێشرێتە فەلسەفەی ئەخلاقەوە، فەلسەفەی ئەخلاقی زەردەشت زیاتر لە لقە فکریەکانیتری ئەو، باس لەو کاریگەرییەتییە دەکات کە بارودۆخی کۆمەڵایەتی لەسەری داناوە.

باوەڕی زەردەشت سەبارەت بە چارەنووسی مرۆڤایەتی زۆر سادە بوو، زەردەشت بەپێچەوانەی میهرئایینەکان کە دواتر پەیدا بوون و نیهادی مرۆڤیان بە بەهرەیەک لە خوا زانی، ئەوەی بە خوڵقکراوی خوا زانی، نیهاد خاوەنی دەستپێکی زەمەنییە، بەڵام گەر لە پانتای زەوییدا بە هەوڵی خۆی لەگەڵ خراپەدا شەڕ بکات ئەوە دەستی دەگات بە ژیانێکی هەمیشەیی،

نیهــاد[١] له دوورپێیــانی کــردەوەی چــاک و کــردەوەی خراپــدا توانــای ئیختیارکردنی هەیە و خاوەنی پێنج لایەنە:

١. ویژدان
٢. هێزی ژیان
٣. وەرگرتن
٤. رەوان
٥. فرەوشی

فرەوشــی[٢] له ســەفەری ئاخیرەتــدا پــارێزەری تاکەکــانەو دوای مەرگ لەگەڵ وەرگرتن و رەواندا یەک دەگرێت، ئەم سێ بناغەیە وەک یەکەیەکی لێک جیانەکراوییــان لێــدێت و رەهــا له کــۆت و بەنــدی جەســتەیی بەرەو جیهانه سەرەوەکان دەفڕن[٣]. ئەمانە دەگەنە چەند پلەوپایەیەکی وجودی:

١. پلەی ئەندێشە چاکەکان.
٢. پلەی وتە چاکەکان.
٣. پلە کردەوە چاکەکان.
٤. پلەی شکۆی جاویدان رەوان له پلەی شکۆی جاویداندا بێ ئەوەی له تاکایەتی خۆی بەدەر بێت، پێوەند دەدرێتەوە بە بنەمای رووناکی.[٤]

---

1 نیهاد: واته ناخ و سروشتی مرۆڤ.

2 هاگ ئەم رۆحە پارێزەرانەی لەگەڵ مۆسۆلەکانی ئەفلاتووندا قیاس کردووە، بەڵام لەبیرمان نەچێت که فرەوشی بە پێچەوانەی مۆسۆلەکان بریتی نین له سەمبولگەلێک که شتەکانی ئەم جیهانەیــان له رووی ئەوەوە دروســت کردبێــت. مۆســۆلەکان هەرمــانی و بــێ زەمــان و بــێ مەکانن، فرەوشیەکان پارێزەری رۆشناییین، بەڵام مۆسۆلەکانی ئەفلاتوون سەمبولگەلێکی کامڵ و سەرترن له هەر هەستێک. لیکچوونی ئەم دوانە رواڵەتییە.

3 بەباوەڕی سۆفیەکانیش بناغەی مرۆیی خاوەنی سێ بەهرەیە: نەفس و دڵ و رۆح. دڵ که هەم مادەیە و هەم نامادەیە دەبێتە ناوبژیوانی نەفس و رۆح و هۆی مەعریفەی ئەشرەفە. دەکرێ وشەی زەمیر یان ویژدان که بەکارهاتووە بە مانای وشەی سۆفیانەی دڵ لێکبدەینەوە.

4 له جیهانناســی سۆفیەکانیــشدا رۆحــی مــرۆڤ له ســەفەری ئاســمانی خۆیــدا له چەنــدین قۆنــاغەوە تێپەڕ دەبێت. سۆفیەکان باسیان له ٥ قۆنـاغ کـردووە، بەڵام چۆنێتی ئەم قۆناغـانە

## مانی و مەزدەك

لەوە تێگەیشتین کە زەردەشت بۆ کردنەوەی گرفتی ئاڵۆزی "بوون" یان وجــود ڕێگەچــارەیەکی دۆزیەوە و لە پــاش ئەو ســەبارەت بەم بــابەتە موجـادەلەیەکی ئـایینی یـان فەلـسەفی سـەری گـرت و گەیـشتە لێکپچڕانـی دەزگـای ئـایینی زەردەشـت، مـانی نیـوە ئێرانـی کە مەسـیحییەکانی دوایـی ئەویـان ناونـا "دامەزرێنەری ئـومەتی بێ خـوا" هەنگـاوی نـایە ئەم ڕێگـاوە. مانی هاوڕای ئەو زەردەشتیانە بوو کە مزدیسنایان بێ لق و پۆپ دەویست و بە ڕوانگەیەکی بە تەواوەتی مادییەوە ڕوانیە بابەتی گشتیەتی جیهـانەوە، بـاوکی لە بنەڕەتـدا ئێرانـی بـوو، کە لە (هەمەدان)ەوە بەرەو بـابول کـۆچی کـرد. مـانی سـاڵی ٢١٥ یـان ٢١٦ ی زایینــی واتە کاتێـک کە بوداییەکــان بانگەشــەی ئایینەکەیــان دەکـرد و بــۆ ئەم مەبەســتە هــاتبوونە نیــشتمانی زەردەشـتەوە، لەدایـک بـوو. مـانی جـۆرە سیـستمێکی تێکەڵـی هێنـا، چەمکی

---

هەنـدێک جیـاوازی هەیە لەگەڵ چـۆنێتی قۆناغەکـانی ئـایینی زەردەشـت. قۆنـاغە پێنجیەکـانی سۆفیەکان بەم شێوەیەن:

١- جیهانی جەستە واتە ناسوت.
٢- جیهانی عەقڵی موجوڕەد واتە مەلەکوت.
٣- جیهانی دەسەڵات واتە جەبروت.
٤- جیهانی نەفی واتە لاهووت.
٥- جیهانی بێدەنگی ڕەها واتە هاهووت.

وادیارە کە سۆفیەکان ئەم قۆناغانەیان لە جووگیە هیندیەکان وەرگرتبێت. جووگیەکان باس لە حەوت قۆناغ یان ئاستی بوون دەکەن:

١- قۆناغی جەستەیی.
٢- قۆناغی هاوزادی اثیری.
٣- قۆناغی نەشئەی ژیان.
٤- قۆناغی سرووشتی کردەوەیی.
٥- قۆناغی فیکر.
٦- قۆناغی ڕۆحی مەعنەوی یان عەقڵ.
٧- قۆناغی ڕۆحی موجەڕەد.

"فـلاح"ی له ئـایینی مەسـیحیەتەوە وەرگـرت و بە ئـازاییەوە پەرەی پێـدا و بەشێوەیەکی لۆژیک ئەوەی سەلماند کە جیهان لە زاتـی خۆیدا خـراپە، بەو شێوە سیستمی ئایینی مانی بـواری زوهـد و مەینەتـی کێشانی رەخساند و لە زووتـرین کاتـدا وەک هێزێکـی کـاریگەری لێهـات و دژەی کـردە نـاو ئەندێـشەی هـۆزە جیاوازەکـان: لەلایەکەوە رێـگەی کـردەوە لە نـاو مەسیحیەتی رۆژهەلات و رۆژئاواوە و لەلایەکیترەوە لە رەوتـی فەلسەفەی ئێراندا جێ پەنجەی خۆی دانا.

لەم بـوارەدا ئـێمە هەڵـسەنگاندنی سـەرچاوە ئایینیەکـانی ئـاینی مـانی دەسـپێرینە رۆژهەلاتناسـەکان و خۆمـان ئـاوڕ دەدەیـنە سـەر جیهـانبینی فەلسەفی ئەو[1].

مـانی یـان بە وتەی ئەردەمـان ئەم "گنۆسـتیکە کفـر ئـافرێنەرە" فێرمـان دەکات کە هەموو شتەکان لە تێکەلاوی دوو بنەڕەتـی هەرمـانی - روونـاکی و تاریکـایی- پێکـدێت. روونـاکی و تاریکـایی سـەربەخۆ و لەیەکتـر جیـان. بنەڕەتی رووناکی خۆی هەڵگری دە چەمکە: بەسـەبربوون، مەعـریفە، درک پێکـردن، روانـین، عەشـق، ایقـان، ئیمـان، چـاکخوازی، هـزر. هەر بەمـشێوە بنـاغەی تاریکـایی لە خـۆگری پێـنج چەمکـی هەرمـانییە: میـغ، دووکەڵ، ئاگرکەوتنەوە، ژەهرەکان، رەشایی. مانی بێجگە لەم دوو بنـاغە سـەرەتاییە، ئاسمان و زەویش بە هەرمانی دەزانێت و ئەم بابەتانە دەچەسپێنێت بەوانە:

[1] هەندێک لە مانی ناسە رۆژهەلاتیەکان وەک سـوروس کە لە پێشەکی کتێبی سـروودی رۆح نووسراوەی بەوان، A.A.Bevan ناوی لێبراوە، لەسەرئەو باوەڕەن کە مانی یەکێک بووە لە قوتابیەکـانی گنۆسـتیکی سریانی، باردەسـانس Bardesanes بـووە. لەکاتێکدا کە محمـد بـن اسحاق الندیم ئامادەکاری شارەزای کتێبی الفهرست، باسی لەچەندین وتـار کردووە کە مـانی دژ بە گنۆسـتیک نووسـیویەتی. باردەسـانس روانگەیەکـی مەسـیحی هەیە و لەگەڵ وانەکـانی مانییدا سازگار نییە. بە گشت ئەم باسانەوە ابن حزم لە کتێبی (الفصل فی الملل و الاهـواء و النحل) دا دەنووسـێت: ئەم دووانە لە زۆر بابەتدا لێکچوونیـان هەیە، بەلام ئەم جیـاوازیەش لە ئارادایە کە مانی زوڵمەتی بە توخمێکی زیندوو دەزانی.

مەعریفە و درک کردن و زانستی شاراوە و روانین و نەسیم و هەوا و ئاو و رووناکی و ئاگر.

تاریکایی کە بناغەی مێینەی بوونە، حەشارگەی توخمەکانی خراپەیە، ئەم توخمانە بە تێپەڕینی کات کۆدەبنەوە و دەبنە دروستکەری شەیتانی جەستەی ناحەز، شەیتانی ناحەز جەستە کە یەکەمین پەروەردەی منداڵدانی ئاگرینی تاریکاییە، سەرچاوی چالاکی جیهانە. هەر لەوکاتەوە کە دەخوڵقێت هێرش دەکاتە سەر هەرێمی پاشای رووناکی، ئەویش بۆ ئەوەی بەڵاگەردانێک بدۆزێتەوە، یەکەمین مرۆڤ دەخوڵقێنێت، پاش ئەوە شەڕێکی قورس لە نێوان شەیتان و یەکەمین مرۆڤ سازە دەبێت و مرۆڤ بە توندی تووشی شکست دێت، شەیتان پێنج توخمی تاریکایی و پێنج توخمی رووناکی تێکەڵ دەکات، پاشای رووناکی بە هیوای ئەوەی کە توخمەکانی رووناکایی لە بەندیخانەی تاریکایی رزگار بکات، دەفەرموێت بە ژمارەیەک لە فریشتەکانی خۆی کە لەگەڵ ئەو توخمانەدا تێکەڵ بن و ئەم جیهانە بخولقێنن.

لەبەرئەوەی کە هێرشهێنانی توخمەکانی رووناکی ئاوێتەی توخمەکانی تاریکایی کردووە و ئالوودە بووە، هەربۆیە هەرێمی رووناکی پێویستی بە رزگاربوونە. لێرەدایە کە جیهانناسیی مانی بەرەو لای چەمکی رزگاربوونی مەسیحی دێت، هەر بەو جۆرەی کە جیهانناسیی هیگڵ لە چەمکی تەسلیسی مەسیحیەتەوە هەوێن دەگرێت.

رزگاربوون لای مانی پەیوەستە بە جیهانی جەستە و پەیوەستە بەوەی کە وەچە نەخرێتەوە، منداڵبوون زەمەنی بوونی رووناکی درێژتر دەکاتەوە و ئەمەش لە زیانی رووناکیدایە، لەژێر تیشکی رزگاربوونێکی وەهادا وردیلەکانی دیلکراوی رووناکی هێدی هێدی لە قووڵایی زەوی کە خانووی تاریکاییە ئازاد دەبن و بەرەو ڕۆژ و مانگ هەڵدەفڕن و پاشان بە یارمەتی

فریشتەکان دەگەنە هەرێمی ڕووناکی و هەرمانی[1] ماڵی پاشای بەهەشت، لە ئاستانەی "پیدوزرگی" واتە باوکی شکۆ.[2]

جیهانناسیی وەهماویی مانی بەمشێوەیە بوو، مانی بۆ ڕوونکردنەوەی جیهانی عەینی لە ڕوانگەی زەردەشت کە لە خۆگریی دوو ڕۆحی داهێنەرە خۆی لادا و بە ڕوانگەیەکی مادییەوە سەیری ئەم بابەتەی کرد، لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە جیهانی نموود لەدایکبووی تێکەڵبوونی دوو بناغەی سەربەخۆی هەرمانییە و یەکێک لەم دوو بناغەیە واتە بناغەی تاریکایی نەک هەر بەشێکە لە هەوێنی عالەم بەڵکو سەرچاوەی چالاکیشە.[3]

چالاکییەکی خەوتوو کە ئەگەر دەرفەتی بۆ بڕەخسێت ئاگر دەکاتەوە، ئاوەهایە کە لە نێوان جیهانناسیی مانی و جیهانناسیی حەکیمی گەورەی هیندی "کاپیلا" لێکچوونێکی سەیر هەیە، "کاپیلا" ئافراندنی جیهان دەگەڕێنێتەوە بۆ سێ هۆکار: سات واSattwa یان چاکە، تاماس Tamas یان تاریکایی و ڕاجاس Rajasیان شۆڕش و بزووتنەوە، لە ڕوانگەی ئەوەوە کاتێک باڵانس یان پراکریتی نەما، ئەم سێیە پێکەوە ئاوێتە بوون و سرووشتیان سازاند، حەکیمەکانی تریش بۆ ڕوونکردنەوەی گرفتی ئاڵۆزی سرووشت هەندێ ڕوانینیان هەبوو، بۆ وێنە "ودان تاگرا"کانی هیند بە

---

[1] هەرمانی : نەمریی.

[2] سەرچاوەکانی مانی:

محمد بن اسحاق الندیم، کتاب الفهرست، پێداچوونەوەی فلوگێل و ئەوانیتر، لایپ زیگ، ١٨٧١، ل ٥٢-٥٦.

احمد بن ابی یعقوب، تاریخ الیقوبی، پێداچوونەوەی هوتس ما، لەندەن، ١٨٨٣، ل ١٨٠-١٨١.

ابی محمد علی حزم، الفصل فی الملل و الاهواء والنحل، ل٣٥.

ابوالفتح تاج الدین محمد شهرستانی، الملل و النحل، ل ١٨٨-١٩٢.

[3] دەکرێ فەلسەفەی سرووشتی مانی لەگەڵ ئیماژی چینیەکان لە ئافراندن بەراورد بکەین. بە باوەڕی ئەوان هەرچی هەیە لە جیهاندا لەدایکبووی پێوەندی یین لەگەڵ یانگە. Yin & Yang. بەڵام ئەمانیش دەگەڕێنەوە سەر بناغەیەکی تاقانەیتر کە نوی تایکیە یە. Tai Keih لە حاڵێکدا کە مانی وەها بابەتێکی قبووڵ نییە و لەسەر ئەو باوەڕەیە کە سرووشتە دژوارەکان هەرگیز لە بنەڕەتێکی تاقانەوە سەرچاوە ناگرن.

چەمکی سەیری مایاوە باسیان لە زۆرینەیی بوون کردووە و چەند سەدە دواتر (لایب نیتس)ی ئەڵمانی تیۆری "یەکیەتی تاکە جیا نەکراوەکان"ی بە کلیلی ئەم باسە زانی. روونکردنەوەی مانی سەبارەت بە زۆرینەیی هەرچەند بە بابەتێکی مندالانە دەردەکەوێت، بەلام لە رەوتی مێژوویی تیۆرییە فەلسەفییەکاندا بۆ خۆی خاوەن پێگەیە، رەنگە بایەخە فەلسەفییەکەی کەم بێت. یەک خاڵ حاشاهەڵنەگرە و ئەویش ئەمەیە کە: مانی یەکەمین حەکیمە کە جیهان بە بەرهەمی شەیتان و لە بنەڕەتەوە بە خراپی دەزانێت، بە باوەڕی من سیستمێک کە تەرکی دنیا بە ئامانجی ژیان بزانێت بێجگە لەمەش نابێت.

رۆژگاری ئێمەش لەم ئەندیشەیە بەدوور نییە. شۆپێنهاوێریش وەها بیر دەکاتەوە، بەلام پێچەوانەی مانی بناغەی تاکایەتی یان بە وتەی خۆی "خوازیاریی تاوان ئامێزی ئیرادە بەرەو ژیان" بە سەربەخۆ نازانێت، بەڵکو بە بەشێکی جیا نەکراوەی "ئیرادەیەکی سەرتر"ی دەزانێت.

ئێستا ئاوڕێک دەدەینەوە لە مەزدەک جەماوەرخواز یان کۆمۆنیستی بەناوبانگی ئێرانی کەون ئارا.[1] ئەم پێغەمبەرە خەڵکخوازە کە لە سەردەمی ئەنەوشیروانی ساسانییدا دەژیا، واتە سەدەی شەشی مەسیحی، لە بەرامبەر یەکەخوازیی زەروانییەکانی سەردەمی خۆیدا پەرچەکرداری نواند و تیوری دووالیزمی، دووالیزمی هێنایە ئاراوە، وەک مانی باسی لەوە کرد کە جۆریەتی شتەکان بەرهەمی ئاوێتەبوونی دوو بناغەی سەربەخۆی هەرمانییە. یەکێک لەو دووانە بناغەی "شید" واتە رووناکییە و ئەویدی "تار" واتە تاریکاییە.

---

[1] سەرچاوەکانی مەزدەک:

ابوعلی حسن نظام الملک، سیاسەت نامە، شفر، پاریس ١٨٩٧، ل ١٦٦-١٨١

شهرستانی، الملل و النحل، ب یەکەم، ل ١٩٤-١٩٢

احمد بن ابی یعقوب، تاریخ الیعقوبی، ل ١٨٦

Al-Biruni: Choronology of Ancient Nations,Tr.E.Sachau, London, 1879,p.192

مەزدەک بە پێچەوانەی پێشینیان لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئاوێتە بوون یان شەڕی کۆتایی ئەم دووانە بە ئیختیار و لەقەست نییە بەڵکو بەرهەمهاتووی ڕێکەوت و سوتفەیەکە، خوا لە سیستمی فیکریی مەزدەکدا خاوەنی هەستە و لە حزوری شکۆمەندی خۆیدا چوار هێزی سەرەکی هەیە: جیاکردنەوە، مێشک و درک کردن و شادی، هێزە چوارینەکان لە چوار جەستەدا دەردەکەون و ئەم چوار جەستەیەش بە یارمەتی چوار کەسیتر جیهان بەڕێوە دەبەن، تایبەتمەندی بوونەوەرەکان کە دەبێتە هۆی جیابوونەوەیان لە یەکتر خولقاوی ڕێژەی ئاوێتە بوونی هێزە چوارینەکانە.

ترۆپکی وانەکانی مەزدەک خەڵک خوازییەکەیەتی و بێگومان خوازیاریی مانەوییەکان بۆ جیهان نیشتمانیی کاریگەریەتی داناوە لەسەر ئەم خەڵک خوازییە. مەزدەک دەیوت هەموو تاکەکانی مرۆڤ پێکەوە یەکسانن، بەڵام دێوە خراپەکان کە دەیانەوێت جیهان بکەن بە پانتای ڕەنجێکی بێ کۆتایی بە تەزویرکردنی چەمکی خاوەندارێتی تاکی، خەڵک بێ بەها دەکەن.

هەرچەند بە باوەڕی پەیڕەوەکانی مەزدەک، ئاگری پیرۆز هاتە قسە و شایەتی دا بۆ ڕاستبوونی پەیامەکەی مەزدەک، مۆبەدە زەردەشتییەکان کە بە تایبەتی لایەنی کۆمەڵایەتی ئایینەکەی ئەویان بە دڵ نەبوو، مەزدەک و پەیڕەوەکانیان کوشت.

### ٣. ئەنجام

هەندێک لە لایەنەکانی فەلسەفەی ئێرانی کەون ئارامان باس کرد، بەداخەوە بزووتنەوە فەلسەفییەکانی ڕۆژگاری ساسانی و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و فکریی ئەو کاتە کە پێکهێنەری دەرکەوتن و گەشەکردنی ئەو بزووتنەگەلە بێت بۆ توێژەرەکان ئاشکرا نییە، هەربۆیە ئێمە نەمانتوانی سەبارەت بە چەمکە فەلسەفییەکانی ئێرانی کەون ئارا و بەردەوامییان بە باشی ئەرکەکەمان بەجێ بگەیەنێن.

سـەرەتای كـاری هۆزەكـان وەک سـەرەتای كـاری تاكەكـان، چـالاكی عەينييە، وەها دەنوێنێت كە فيكری ئێرانی كەون ئارا بەرەو جيهانی عەينی بـووە و روانگەيەكـی مـادی و دووالیزمـی هەبـووە، بەڵام لە ژێـر تیشكی ئـايينی ئەخلاقـی زەردەشـت رەنگـی مەعـنەوی بەخـۆوە گرتـووە، لەم سـەردەمەدا بـوو كە بنـاغەی تەوحیـد لە بـاری فەلـسەفییەوە، بەڵام بەشێوەيەكی نادیار باسكرا.

لە دەمەقاڵەكـانی پەیڕەوەكـانی زەردەشـت وەهـا دەردەكەوێـت كە بلیمەتەكانی ئێرانی كەون ئارا بەرەبەرە بۆیان دەركەوت كە پێویستە بوون بە فەلـسەفەيەكی يەكەوە لێـک بـدرێتەوە. بە داخەوە لەبەر كەمبـوونی دۆكیۆمێنت نـاكرێ سـەبارەت بە چۆنیەتی خوازیـاریی ئێرانییەكانی كەون ئـارا بـۆ ئەندێـشەی يەكەی بـوون، باسـێكی پـتەو بكرێت، ئەم خـاڵە بـاش دەزانـین كە لە سـەدەی شەشـی مەسـیحییدا، ئیمپراتـۆری رۆمـا "يۆسـتی نینـانۆس" بـارودۆخێكی دژواری بـۆ فەیلـسووفەكان خوڵقانـد و هەربـۆیە "دیۆگنس سیم پلی سیۆس" و ژمارەيەكیتر لە حەكیمە نوێ ئەفلاتوونیەكـان پەنایان بردە بارەگای ئەنەوشیروانی ساسانی كە پاشـايەكی لێبـوردە بـوو، بە فەرمانی ئەم پادشایە چەندین كتێبی سەنسكريت يۆنـانی تەرجەمە كرانە سـەر زمـانی پەهـلەوی، هـیچ دۆكـۆمێنتێكی مێژوويـی كە بتوانێـت رێـژەی كـاريگەرێتی ئەم ڕووداوانە پیـشان بـدات بە دەسـتەوە نیـیە، هەربـۆیە ناچاریین ئەم باسە بەجێ بهێڵین و بڕۆینە سـەردەمی دوايـی، زەمەنێک كە ئـايينی ئیـسلام هـاتە نـاو ئێـران و بە لێكترازانـی دیـسیپلینی دێرینـی ژیـان، بیرمەندانی لەگەڵ چەمكی تەوحیدێكی بێ ئەمـلاولا ئاشـنا كـرد و دووالیـزم يۆنـانی (خـوا و مـادە)ی لە جێگەی دووالیـزم ئێرانـی واتە (خـوا و شـەیتان) دانا.

# بوشی دووەم

# ئەرەستووە نویٚ ئەفلاتوونیەکان

## ١. گۆڕانکاریی فەرهەنگی ئێران

بە زاڵبـوونی عەرەب بەسـەر ئێرانـدا سـەردەمێکی نـویٚ لە مێـژووی فەلـسەفەی ئێرانـدا دەسـتی پێکـرد، ڕۆڵە شـەڕکەرەکانی بیابانەکـانی عەرەبستان لە شەڕی نەهاوەندیدا بە شمشێرەکانیان سەربەخۆیی سیاسی ئێرانـی کەون ئارایـان لەنـاوبرد، بەڵام توانـای ئەوەیـان نەبـوو کە ئـازادی فکری ئێرانییە نویٚ موسڵمانەکان بە تەواوەتی بسڕنەوە.

پـاش سـەرکەوتنی عەرەبەکـان، شۆڕشـی سیاسـی لە ئێرانـدا دەسـتی پێکـرد و لەو سـاتەدا فەرهەنگەکـانی سـامی و ئاریـایی لە یەکتـردا تـێکەڵ بوون، ئێرانییەکان هەرچەند ڕەنگی سامییان دا لە ڕواڵەتی ژیـانی خۆیـان، بەڵام هێدی هێدی ئیسلامیان لەگەڵ شێوازەکانی فکری ئارياییدا هاوئاهەنگ کـرد، هەروەک چـۆن یۆنانییەکـانیش گۆڕانکارییـان لە مەسیحیەتدا کـرد کە ئایینێکیتری سامی بوو.

لە هەردوو وێنەکەدا ئاکامێکی یەکسان لەبەردەستدا بوو: یۆنانییەکـان و ئێرانییەکـان بە مەبەسـتی نەرم و نیـانکردنی یاسـایەکی ڕەهـا کە لە دەرەوە هـاتبوو، هەوڵیـاندا بـۆ لێکدانەوە و تەعـدیلکردنی مەسـیحیەت و ئیسلام، بە وتەیەکی تر هۆکاری دەرەکییان گۆڕی و کردیان بە هۆکارێکی ناوخۆیی و ناوەکی.

لە ئێرانـدا گۆڕانکـاریی ئیـسلام بە لێکـدانەوەی فەلـسەفەی یۆنـانەوە دەسـتی پێکـرد، چەنـد هۆکارێـک و بەتـایبەت فەلـسەفەی یۆنـانی فکـری ڕەسەنی ئێرانییان لە ڕەوتی خۆیدا بەرەو لاڕێ بـرد و بـوونە هـۆی ئەوەی

که بیرمەنـدە ئێرانییەکـان بەتونـدی خۆیـان لە خوازیـاریی عەینـی بەر لە ئیسلام بپارێزن و خوازیـارییەکی زەینـی پەیدا بکەن، بە ڕای مـن لە ژێـر تیـشکی ئەم دزەکـردنە نـامۆیە بـوو کە لە کۆتاییەکـانی سـەدەی دووهەمـی کۆچییدا تاکخوازیی لیلی کەون زیندوو کرایەوە، روخـسارێکی مەعنەویتـری بەخـۆوە گـرت و دووالیزمـی ڕوونـاکی و تاریکـایی کە پێـشتر هەبـوو بە شێوازێکی رۆحانی هێنایە ئاراوە. بە وتەیەکیتر فکری نەرم و نیـانی ئێرانـی بە یـارمەتی فەلـسەفەی یۆنـانی فریـای خـۆی کەوت، هێـزی لێـوەرگرت و پاشان لە خۆیدا سـوواندی، هەربـۆیە دروسـتە کە سیـستمە فەلـسەفییەکانی نوێ ئەفلاتوونیەکانی ئێران بخەینە بەر سەرنج، هەرچەند بە کـورتیش بێت و هەرچەند کە گرنگایەتیەکی وەهایان نییە لەنـاو مێـژووی فکـری رەسـەنی ئێراندا.

لەبیرمان بێت کە زانستی یۆنـانی لە ڕێگەی ئێـران و سـوریاوە گەیـشتە موسـوڵمانەکانی رۆژهەڵات، سـورییەکان دوایـین لایەنەکـانی فکـری یۆنـانی واتە فەلـــسەفەی نـــوێ ئەفلاتوونیـــان وەرگـــرت و گواســـتیانەوە بـــۆ موســـوڵمانەکان، بەڵام موســـوڵمانەکان ئەم سیـــستمە فکرییەیـــان بە هـــی ئەرەستۆ زانـی و موناقەشـەی زۆریـان لەسـەر کـرد، ئەمە سەرسـوڕهێنەرە کە ئەعراب و ئێرانییە موسـوڵمانەکان مـاوەیەکی زۆریـان تەرخـان کـرد بۆ فکرەکانی بەناو تایبەت بە ئەرەستۆ و ئەفلاتوون، بەڵام هیچ کات نەیـانزانی کە بۆ درککردنـی فەلـسەفەی ئەفلاتـوون و ئەرەسـتۆ زانینـی زمـانی یۆنـانی پێویستییەکی حاشاهەڵنەگرە، وەها لەم بابەتە غافڵ بوون کە وەرگێڕدراوی کۆیەک لە تاسووعاتی "پلۆتینیۆس" یان بە ناوی ئیلاهیاتی ئەرەستۆ قبـووڵ کردبوو. چەندین سـەدە تێپەڕی ئینجا ئەوان گەیـشتنە وێنەیەکی رۆشـن و دیار لە ئەفکاری ئەو دوو مامۆستا گەورە، لە بنەڕەتەوە ناتوانین دڵنیـا بین لەوەی کە موسـوڵمانەکان فەلـسەفەکانی ئەفلاتـوون و ئەرەسـتۆ بە باشـی حـاڵی بـووبێتن، ئەو راسـتییەی کە دەتـوانین لێرەدا بیڵێین ئەوەیە کە ئیبن

سینا بەئاگاتر و هەروەها داهێنەرتر بووە لە فارابی و ئیبن مەسکەویە، هەروەها ئیبن ڕوشد هەرچەند باش لە فەلسەفەی ئەرەستۆ تێنەگەیشتبوو، بەڵام زیاتر لە پێشینانی خۆی لە ئەرەستۆ نزیکتر بوو، رەوا نییە کە حەکیمەکانی ئیسلام تەنها بە لاساییکەرەوەی رەهای فەیلەسووفانی یۆنان بزانین، مێژووی عەقڵی حەکیمە موسوڵمانەکانی ئێران پیشاندەری هەوڵی بێوچانی ئەوانە کە بۆ کردنەوە و بڕینی ڕێگەی دژواری خۆیان کردیان، وەرگێڕەکانی فەلسەفەی یۆنانی بەهۆی بێ سەرنجی کۆمەڵێکی گەورەی باتڵ و هەڵەیان پێیەوە نابوو، هەر بەم شتە باتڵانەوە ڕێگەی ناسینی فەلسەفەی یۆنانیان بەسەر حەکیمە ئیسلامییەکاندا داخستبوو.

حەکیمەکان بە حوکمی پێویستبوون فەلسەفەکانی ئەفلاتوون و ئەرەستۆیان هەڵسەنگاندەوە و ڕێکیان خستەوە، هەربۆیە هیچکام لە پێداچوونەوەکانی ئەوان بەسەر ئەفکاری یۆنانییدا لێکدانەوەی پێناسەکردن نییە، بەڵکو لێکدانەوەیەکی رەخنەیی یان داهێنەرانەیە، گومان لەوەدا نییە کە هەر ئەم بارودۆخە بووە هۆی ئەوەی کە حەکیمە ئێرانییەکان دەسەڵاتی ئەوەیان نەبێت کە سیستمی سەربەخۆی فکریی بهێننە ئاراوە و زەینی تاریکی ئەوان ببێتە ئەسیری "لاطائلات"ی نالەباری قورس و بەهۆی ئەوەشەوە بابەتی بەخەوش و بێ خەوش ئاوێتە ببن، ئێستا کە پێشەکییەکان باسکران و لەوە بووینەوە، ئەندێشەی هەندێک لە کەسایەتیە ئێرانییەکانی فەلسەفەی یۆنانی لێک دەدەینەوە.

### ٢. ئیبنی مەسکەویە:

وتەکان کورت دەکەینەوە و چاوپۆشی لە احمد بن محمد سرخسی[1] دەکەین و ابو نصر فارابی تێدەپەڕین، هەروەها ابوبکر محمد بن زکریای ڕازی پزیشکی بەناوبانگ کە بەپێی سوننەتی ئێرانی نووری بە مەخلووقی یەکەم، مادده و شوێن و زەمەنی بە کەون دەزانی، لەم باسەدا چاوپۆشی لێکراوە و ڕێک دەچینە سەر باسکردن لە ئیبنی مەسکوویە.[2]

ابو علی احمد بن محمد ناسراو بە ئیبنی مەسکەویە، کۆچکردوو لە ساڵی ٤٢١ ی کۆچییدا خەزێنەداری سوڵتان عضد الدولە دەیلەمی بوو، کە بە یەکێک لە بەڕێزترین فەیلەسووفەکانی خواپەرست دەژمێردرێت و هەروەها لە پزیشکی و زانستی ئەخلاق و زانستی مێژوو پلەیەکی بەرزی هەیە، بەپێی کتێبە بەنرخەکەی کە ناوبانگی زۆریشی هەیە واتە" الفوز الاصغر" سیستمی فەلسەفییەکەی بە کورتی دەخەینە بەر باس.

### هەبوونی بنەمای کۆتایی

ئیبن مەسکەویە پەیڕەوی ئەرەستۆ بوو و بە شێوەی ئەو حەرەکەی مادی بە بنەڕەتێکی پێویست دانا و ئاوای گوت: حەرەکە کە بریتییە لە هەر جۆرە گۆڕانکارییەک، تایبەتی جیانەکراوی هەموو شتەکانە، بەڵام حەرەکە لە زاتی شتەکانەوە هەڵناقوولێت و کەواتە پێویستی بە سەرچاوەیەکی دەرەکی یان بزوێنەرێکی سەرتر هەیە. ئەگەر وای دابنێین کە حەرەکە لە زاتی شتەکانەوە دێت گریمانەکەمان لە ئەزموونددا تووشی گرفت دەبێت.

---

[1] بە داخەوە کە لە بەرهەمەکانی سرخسی کە یەکێک بووە لە قوتابیە دیارەکانی یعقوب بن اسحق الکندی، فەیلسووفی عەرەب هیچ بە جێنەماوە.

[2] دێبۆر De Boer لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (مێژووی فەلسەفە لە ئیسلامدا) بە کامڵی فەلسەفەکان فارابی و ئیبنی سینا لێکدەداتەوە، بەڵام لە گێڕانەوەی فەلسەفەی ئیبنی مەسکوویەدا تەنها باس لە وانە ئەخلاقییەکانی دەکات. من لێرەدا ئاوڕ لە فەلسەفەی ئیبنی مەسکوویە دەدەمەوە کە بە رای من ڕێکترە لە فەلسەفەی فارابی.

بۆ وێنە هەرچەند مرۆڤ بە ئەندامە جیاوازەکانی خۆیەوە ئازادانە دەبزوێت بەڵام هیچ کام لەم ئەندامانە بەجیا نابزوێن و ئەم بابەتە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە حەرەکە پێکهاتووی ئەندامەکان نییە. کەواتە تەسەلسوولی هۆکارە جووڵاوەکان دەبێت بگاتە ئەنجامی هۆیەک کە خۆی نابزواوە و جوڵەی نییە، بەڵام هەموو شتەکان دەخاتە جووڵە، هۆی سەرتری بزووتن دەبێ لە زاتی خۆیدا جووڵاو نەبێت لەبەر ئەوەی گریمانەی بزووتن لە هۆدا پێویستیی تەسەلسوولی هۆکارە جووڵاوەکانە و ئەمەش باتڵە.

بزوێنەری نابزواو ناتوانێت لە یەک زیاتر بێت، ئەگەر زیاتر لە یەک بزوێنەری رەسەن بوونی هەبێت لەوکاتەدا دەبێ بزوێنەرە رەسەنەکان بە حوکمی ئەوەی کە سەر بەبابەتێکی یەکسانن دەبێ تایبەتمەندی هاوشێوەیان هەبێت و لە هەمانکاتدا بۆ ئەوەی لە یەکتر بناسرێنەوە دەبێ خاڵی جیاوازیشیان هەبێت، لەم سیمای لێکچوون و جیاوازیانە ئاوەها دەردەکەوێت کە بزوێنەرە رەسەنەکانی ئێمە زاتێکی چەند لایەنەیان هەیە. بەڵام تێکەڵبوونیش شێوازێکی جوڵەیە و هەروەک باسکرا جووڵە ناچێتە ناو هۆکارە سەرترەکانەوە و هەروەها رابردوو بزوێنەری سەرتری قەدیمە. لەبەرئەوەی کە ئەگەر قەدیم نەبێت دەبێ لە عەدەم یان نەبوونەوە سازدرابێت و گواستنەوە لە نەبوون بەرەو بوون پێویستی بە جووڵەیە. ئەو بابەتەی کە بەردەوام حەرەکە دەکات ماددەیە و لەم حاڵەتەدا بابەتێک کە پەیوەندی بە ماددەوە نەبێت و جووڵەی نەبێت بێ ئەملاولا هەمان قەدیمە.

# ناسینی بنەمای کۆتایی

هەست یان وێنەی هەست سەرەتای ناسینی مرۆییە، بەڵام بەرەبەرە گۆڕانکاری وەردەگرێت و بە وێنەی دەرککردنی تاک ڕەهەند یان عەقڵ دەردێت، ڕاستییە دەرەکییەکان یەکەمین قۆناغەکانی ناسین سنووردار دەکات، بەڵام ناسین لە گەڕیانی پێشکەوتنی خۆیدا بەرەبەرە لە کۆت و بەندی مادده دەرەخسێت، کەواتە دەکرێ بوترێ کە ناسین لە سەرەتادا چالاکیەکی مادیە، بەڵام ئارام ئارام لە بوارە مادیەکەی خۆی دوور دەکەوێتەوە، خەیاڵکردن یەکێکە لە قۆناغەکانی ناسین، خەیاڵکردن هێزێکە کە نیگار یان شتی هەبوو لە کاتی غیابی ئەو شتە لە زەیندا ئامادە دەکات، پاش خەیاڵکردن عەقڵ دێتە ئاراوە، زەین لە قۆناغی عەقڵ و بیرکردنەوەدا زیاتر لە جاران ڕەها دەبێت و خەریکی دروستکردنی ڕوخسارە عەقڵیەکان دەبێت، بەڵام دیسان لەم قۆناغەشدا بە یەکجاری دنیای هەستپێکراو بەجێ ناهێڵێت، چونکە لەهەر حاڵەتێکدا پێیەکی لەسەر دنیای هەستەکانە و ڕوخسارە عەقڵیەکان لە کۆبوونەوە و یەکگرتنی ڕوخسارە هەستییەکان سازدراون، بە هەموو ئەو باسانەوە نابێ لە جیاوازی گەورەی ڕوخسارە عەقڵیەکان و ڕوخسارە هەستییەکان غافڵ بین، ڕوخسارە هەستییەکان یان هەستپێکردن یان درککردنی هەستاوی بابەتێکی پاژەیی و گۆڕاوە، هەربۆیە ناسین تا نەگاتە قۆناغی درککردنی ڕەها یان عەقڵ سەقامگرتوو نییە، ڕوخسارە عەقڵیەکان بابەتێکی گشتی و لە بەدواهاتنی یاسای گۆڕان ئازادە، ئەو بابەتەی کە پاژەیە دەگۆڕدرێت، بەڵام ئەو شتەی کە گشتییە ڕاوەستاو دەبێت، مادده لەخۆیدا هەڵگری یاسای گۆڕانە و بوونەوەرەکان هەرچی لە مادده ئازادتر بن کەمتر دەکەونە بەردەم گۆڕانکاریی، کەواتە خوا کە تاقانەی ڕەهایە بە تەواوەتی بێ گۆڕانکارییە و بەهۆی ئەم تاقانەییە ڕەهایەوەیە کە وێنەکردنی خوا بۆ ئێمە دژوار و بگرە ئەستەمە، پەروەردەکردنی فەلسەفی ئامانجێکی نییە بێجگە لەوەی کە گەشە بە فکری ئێمە بدات وەها کە بتوانین گریمانە ساز بکەیین یان سەبارەت بە ڕوخسارەکانی عەقڵ بیر بکەینەوە و بە ڕاهێنانی بەردەوام لە ڕوخسارەکانی تاقانەی ڕەها تێبگەین.

## هەنارده کردنی زۆرینەیی لە یەکیەتیەوه

بۆ ئەوەی بابەتەکە ئاسانتر بێت بیروڕاکانی ئیبن مەسکەویە سەبارەت بەم باسە دەکەینە دوو بەشەوە: هەناردەکردنی بوون لە نەبوون و چۆنیەتی ئەم ناردنە.

ئەلف - هەناردەکردنی بوون لە نەبوون: ماددەخوازەکان هەیکەلی پێشتریان بە قەدیم و روخساریان بە خوڵقاوی چالاکی داهێنەرانەی خوا دەزانی، ئەم بابەتە نکوڵی لێناکرێت کە چۆن هەیکەلێک لە روخسارێکەوە پێوەند دەدرێت بۆ ئەویدی، روخسارە پێشووەکە بەتەواوەتی لە ناو دەچێت، لەبەرئەوەی کە ئەگەر روخساری پێشوو بەتەواوەتی لەناونەچێت دەبێ بگوازرێتەوە ناو جەستەیەکیترەوە، یان لەهەمان جەستەی پێشوودا بمێنێتەوە، لایەنی یەکەم لەگەڵ ئەزموونە رۆژانەکاندا ناخوێنێتەوە، بۆ وێنە ئەگەر خڕۆکێک لە مۆم بە شێوازی چوارگۆشە ساز بکەین، خەسڵەتی خڕبوونەکەی ناگوێزرێتەوە بۆ شتێکی تر، لایەنی دووهەمیش ئەستەمە لەبەرئەوەی پێویستی بەوە هەیە کە دوو روخساری دژبەیەکتر واتە خڕبوون و چوارگۆشە بوون بتوانن لەیەک شتدا کۆ ببنەوە، کەواتە ئاوها دەگەینە ئەنجام کە بە هاتنی روخسارە نوێکان روخسارە کۆنەکان بەتەواوەتی لەناودەچن، کۆکراوەی وتەکان بریتییە لەوەی کە تایبەتمەندییەکانی ماددە واتە روخسار و رەنگ لە نەبوونی رەهاوە پێکهاتوون و هەڵکەوتن. مادەی سەرتریش وەک تایبەتمەندیەکانی ماددە پێکهاتەیەکە، بۆ سەلماندنی ئەم بانگەشەیە دەبێ دوو پێشەکی بخەینە بەرچاو:

١. لە دابەشکاریی ماددەی سەرتر ماددەگەلێکی وردتر پێکدێت کە لە باری زاتەوە رێک وەک بابەتە کۆ و سەرەکیەکەی خۆیانن.

٢. له جەوهەردا ماددەی وردتر یان پاژ کە لە دابەشکاریی مادەی کۆپێکهاتووە لە روخسار جودا نابێتەوە و ناتوانێت بێ روخسار لە جیهانی دەرەکییدا بمێنێتەوە.

لەم دوو پێشەکییە ئاوەها دەردەکەوێت کە ماددەی سەرتریش وەک ماددەی پاژ هیچ کات لە روخسار جودا نابێتەوە. ئەمەش دەزانین کە روخسار قەدیم نییە و دەگەینە ئەم ئەنجامە کە ماددەی سەرتریش وەک روخسار هەڵکەوتە.

ب. چۆنیەتی ناردن: ئەم ناردنە مەزنەی کە لە هەموو لایەکەوە ئێمەی گرتۆتەوە پێکهاتەی چ شتێکە و چۆن "زۆر" لە "یەک"ەوە پەیدا بووە؟ فەیلسووفەکەی ئێمە ئیبنی مەسکوویە رایگەیاند کە هەرکات هۆکارێکی تاقانە ببێتە هۆی دروستبوونی پێکهاتووە زۆرەکان، کەواتە ئەم زۆربوونی پێکهاتووەکان پەیوەستە بە یەکێک لەم هۆکارانە:

١. پێدەچێت کە هۆکاری تاقانە خاوەنی هێزگەلێکی جیاواز بێت بۆ وێنە مرۆڤ کە پێکهاتووە لە رەگەز و هێزی جیاواز و دەتوانێت هۆی کردەوەی جۆراوجۆر بێت.

٢. پێدەچێت کە هۆکار بۆ دروستکردنی پێکهاتووە زۆرەکان ئامێری جیاواز بەکاربەرێت.

٣. پێدەچێت کە هۆکار ئیش لەسەر کەرەستە جیاوازەکان بکات.

هیچ کام لەم تیۆرانە سەبارەت بە زاتی هۆکاری کۆتایی یان خوا دروست نییە. ئەگەر وابڵێین کە خوا خاوەنی هێزگەلێکی جیاکراوە لەیەکترە، قسەیەکی ناڕەوامان کردووە، لەبەرئەوەی ئاوێتەبوون لەگەڵ زاتی ئەودا سازگار نییە، ئەگەر بڵێین خوا بۆ سازکردنی زۆرینەیی کەرەستەی جیاوازی بەکاربردووە لەوکاتەدا پێویستمان بە داهێنەرێکە بۆ سازکردنی ئەو کەرەستانە، ئەگەر ئەم داهێنەرە هۆکارێکی بێجگە لە هۆی کۆتایی یان خوا بێت لەو حاڵەتەدا چەندایەتی هۆکارەکان دێتە ئاراوە.

ئەگەر خوا یان هۆی کۆتایی داهێنەری ئەو کەرەستانە بێت، کەواتە بۆ خوڵقاندنی ئەو کەرەستانە، شتی دیکەش لە ئارادابێت. ئەگەر وا بڵێین کە هۆکار لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە کردەوەکان ئیشی کردووە ئاوها بارودۆخێک لەگەڵ چەمکی کردەوەی داهێنەرانەدا دژایەتی دەبێت. کەواتە لە کۆی ئەم باسە دەردەکەوێت کە "زۆر" لە کردەوەی هۆی "یەک" پەیدا نابێت.

بۆ کردنەوەی ئەم گرفتە هیچ ڕێگەیەکمان لەبەردەستدا نابێت بێجگە لەوەی کە بڵێین: هۆی کۆتایی تەنها یەک شتی خوڵقاند و ئەو شتە بووە خوڵقێنەری بابەتی دیکەو دووهەمین گەیشتە سێهەم و خوڵقاندن بەردەوام بوو. ئیبنی مەسکوویە قۆناغەکانی خوڵقاندنی وەک نوێ ئەفلاتوونیەکان بەم شێوە ناوبرد:

بەهرەی خوا لە ڕەوتی خۆیدا بەردەوام لە تایبەتمەندیە بێگەردەکان دوور و لە ئالودەبوونی مادی نزیک دەبێتەوە و ئەنجامەکەی دەگاتە خوڵقاندنی توخمە سەرەتاییەکانی جیهانی خاکی، توخمە سەرەتاییەکان وابەستەی یەکتر دەبن و دیسان یەک دەگرنەوە و بە هۆی ئەم وابەستەیی و دیسان یەکگرتنەوە روخسارە بەرزەکانی ژیان پێکدەهێنین.

شبلی نعمانی، تیۆری ئیبنی مەسکوویەی بەم شێوە کورت کردەوە:

ئاوێتەبوونی زاتە سەرەتاییەکان بووە پێکهێنەری سەخیفترین روخساری ژیان واتە دنیای جەمادی، پاشان قۆناغی سەرتری گەشەکردن واتە دنیای نەباتی پێکهات، سەرەتا ئاڵەفی خۆڕسک و پاشان دەوەن و درەختە جیاوازەکان کە هەندێ تایبەتمەندی ئاژەڵیان هەیە و هەربۆیە بە سنووری نێوان گیا و ئاژەڵ دەژمێردرێن، روخسارێکی ژیان کە نە ئاژەڵە و نە گیا بۆ نموونە مەرجان کە تایبەتمەندی هەردووکیانی هەیە و ناوەندی جیهانی گیا و جیهانی ئاژەڵەکانە. پاش ئەم بوونەوەرە ناوەندیانە، بوونەوەرگەلێک وەک کرم پەیدا دەبن کە خاوەنی هەستی جوڵە و لەمس

کــردنن، هەســتی لەمــسکردن بەرەبەرە دەگۆڕدرێــت و خــۆی دەبێــتە پێکهێنەری هەستەکانی تر، لە دوایی ئەوە قۆناغی بوونەوەرە بەرزەکان کە خاوەنی مێشکن دەست پێدەکات، سنووری قۆناغی مرۆیی ژیانی مەیموونە. مەیمـوون کامـڵ دەبێت و بەرەبەرە وەک مـرۆڤ بـاڵای راسـت دەبێت و خـاوەنی تێگەیـشتن دەکرێـت، بەم شـێوە ئـاژەڵایەتی کۆتـایی پێـدێت و مرۆڤایەتی دەست پێدەکات.

**نەفس**

بۆ تێگەیشتن لە چۆنیەتی نەفس دەبێ زاتی زانست یان تێگەیشتنی مرۆیی هەڵسەنگێنین، مادده بەهۆی تایبەتمەندی چۆنێتی خۆی ناتوانێت لە یەککاتدا دوو روخساری جیاواز بەخۆوە بگرێت، بۆ ئەوەی کەوچکێکی زیـوو ببێتە جـامێکی زیــوو، دەبــێ مــادەی کەوچــک روخــساری خــۆی جێبهێڵێــت و روخــسارێکی نــوێ وەربگرێــت، هەمــوو کەرەســتەکان خــاوەنی وەهــا تایبەتمەنــدیەکن و کەرەســتەیەک کە وا نەبێــت ئەوە کەرەســتە نیــیە، لە هەڵسەنگاندنی درککردنی مرۆییەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کە لە زاتی مرۆڤدا هێزێــک هەیە کە لەیەککاتــدا لە زیــاتر لە یەک شــت تێــدەگات و هەربــۆیە لەیەککاتـدا چەنـد روخـسار لەخۆدەگرێت، ئەم هێـزە لەدایکبـووی مـادده نیـیە لەبەرئەوەی کە لە تایبەتمەنـدی زاتـی مـادده تێـدەپەڕێت، ئەم هێـزە نەفـسی مرۆییە و لە زاتی خۆیدا خاوەنی هێزی تێگەیشتنە لە چەندین شت لەیەککاتدا. پێـدەچێت کە بڵێـین: نەفــس لە ئاســتی زاتــی خۆیــدا یــان بەرهەمــێکە لە ئاســەوارەکانی مــادده یــان خــۆی زاتێکــی مــاددی هەیە، ئەم دوو وتەیە هەردووکی هەڵەیە. نەفس لەبەر چەنـد هـۆ ناتوانێت لە ئاسـەوارەکانی مـادده بێت:

**ئەلف** ـ هەر شتێک کە روخسارگەل و حاڵەتی جیـاواز بەخۆوە بگرێت خـۆی ناتوانێـت یەکێـک لەو روخـسار و حاڵەتـانە بێـت. جەسـتەیەک کە هەڵگری رەنگە جیاوازەکان بێت دەبێ لە زاتی خۆیدا بێ رەنگ بێت، نەفس

له پـێگەی درککردنـی سـیما دەرەکیەکـان روخـسارو حـاڵەتگەلی جیـاواز بەخۆوە دەگرێت و کەواتە خۆی یەکێک نییە لەو روخسار و حاڵەتانە، ئیبن مەسـکەویە حـاڵەتە زەیـنە جیاوازەکـان بە گۆڕانکارییەکـانی خـودی زەیـن دەزانێـت و هەربـۆیە لەگەڵ دەروونـاسـیی هـاوچەرخی" هێزەکـانی زەیـن"دا هاورِا نییە. (۱)

**ب.** روخسارەکان بەردەوام دەگۆڕدرێن، کەواتە دەبێ لەوپەڕی دەڤەری گۆڕانکارییە نەفسانییەکاندا بنەرەتێکی جەوهەری لەئارادا بێت و بە بواری شوناسی نەفس بژمێردرێت.

ئیبن مەسکەویە بەم شێوە ئەوەی سـەلماند کە نەفس لە روخـسارەکانی مادە نییە و ئەوکاتە دەستی دایە سـەلماندنی تاقانە بـوونی نەفس و لێرەدا هەندێ لە خاڵەکانی ئەو باس دەکەین:

**ئەلف ـ** هەستەکان پاش هەستکردن بە خوازەی بەهێز ماوەیەک نـاتوانن هەست بە خـوازەی کەم هێـز بکەن، بەڵام وەهـا نەتـوانییەک لە ناسـینەکانی مرۆڤدا نابیندرێت.

**ب.** کاتێــک کە بــابەتێکی دژوار دەخەیــنە بەربــاس بــۆ ئەوەی کە کەلوپەلەکـانی دەورانـدەورمان نەبـنە لەمـپەر بـۆ چـالاکیە نەفـسانیەکانمان، چـاوی بەسـەردا دادەخەیـن، ئەگەر نەفـس لە زاتـی خۆیـدا مـادی بێـت چالاکیەکەی پێویستی بە دابڕانی نیگا لە جیهانی مادی نابێت.

**پ.** هەستکردن بە خوازەیەکی بەهێز هەست بێ توانا دەکـات و تەنـانەت یەکجـار تووشـی خەسـاری دەکـات، بەڵام عەقڵ بەسـەر هێـزی روخـسار و چەمکە گشتیەکاندا زاڵ و بە توانا دەبێت.

**ت.** بێ توانایی جەستەیی کە بە هۆی تەمەن و بەساڵاچووندا روودەدات کاریگەریەتی لەسەر توانای زەیندا نییە.

---

[1] مەبەست Faculty Pschology کە هەر چـالاکیەکی نەفسانی بە پێکهـاتەی هێزێیـک سەربەخۆ دەزانی.

**ث.** نەفس لە هەندێ لە بابەتەکان تێدەگات کە پێوەندی بە دەرکەوتە هەستییەکانەوە نییە، بۆ وێنە تێگەیشتن لەم خاڵە کە دوو بابەتی دژوار ناتوانن پیکەوە کۆ ببنەوە، بە هەستەکان ناکرێت.

**ج.** لە ئێمەدا هەستێک هەیە کە زاڵە بەسەر ئەندامە جەستەییەکانمانداو هەڵە هەستیەکانمان ساغ دەکاتەوە و گشت ناسینەکانمان ڕێکدەخات و یەکیان دەخاتەوە. وەها هێزێک کە دەرکەوتە هەستیەکان لێکدەداتەوە و هەڵیاندەسەنگێنێتەوە و بایەخی هەرکامیان دەستنیشان دەکات دەبێ خۆی سەرتر بێت لە ماددە.

ئیبن مەسکەویە لە هەموو ئەم خاڵانە ئاوها ئەنجامی کۆکردەوە کە نەفس لە زاتی خۆیدا تاقانەیە و پێویستی وەها تاکبوونێک، خەسڵەتی هەرماناکەیەتی لەبەرئەوەی کە مردن، تایبەتمەندی بابەتە مادیەکانە.

### ٣. ئیبن سینا

لە ناو یەکەمین فەیلەسووفەکانی ئێرانیدا، ابو علی حسین بن عبداللە سینا، کۆچکردوو لە ٤٢٨ ی کۆچیدا، تەنها کەسێک بوو کە بۆ دارشتنی سیستمێکی فکری سەربەخۆ هەوڵی دا. بە بەرەکەتی وەها هەوڵێک کتێبی فەلسەفەی رۆژهەلات یان حیکمەتی رۆژهەلات کە بەشێک لەوەمان لەبەردەستدایە، نووسرا. بێجگە لەوە لە نامیلکەیەکدا کە ئێستا ئامادەیە و باس لە هەوڵی هێزی عەشق دەکات لە سەرانسەری کائیناتدا، پەیکەرەیەک لە سیستمی فکری ئەو دەبیندرێت، رەنگە ئەم پەیکەرە دوایی بە شێوازێکی چڕتر دارێژرابێت.

ئیبن سینا عەشق بە گەڕان بۆ جوانی دەزانێت و لەم پێگەوە جیهان بە سێ بەهرە دەزانێت:

١. ئەوەی کە لە ئاکامدا کەماڵە.

٢. ئەوەی کە لە ئاکامدا نوقسانە.

٣. ئەوەی کە نێوانی ئەم دوو ئاکامەیە.

ئەم سـێهەم بەهـرەی جیهـانە لە راسـتیدا بـوونی نیـیە، لەبەرئەوەی هەرشتێک کە هەیە یان گەیشتۆتە تەشقی کەمال یان لە نوقسانییەوە بەرەو کەمـال دەڕوات. ئامـانجخوازیی مرۆیـی هەمـان رۆیـشتنی عەشـقە بەرەو جەمال و جەمالیش بە بڕوای ئیبنی سینا هەمان کەماڵە. لە پشت کامڵبوونی دیاری گشت نمودەکانەوە هێزی عەشقە کە ئیش دەکات و هەمـوو هەوڵ و بـزووتنەوە و پێـشکەوتنەکان لە عەشـقەوە دێـت. بوونەوەرەکـان وەهـا خوڵقـاون کە بێـزارن لە نەمـان و وەهایـان پێخۆشـە کە تاکـایەتی خۆیـان بەشێوازی جیاواز نمایشت بکەن، ماددەی نادیار کە لە زاتی خۆیدا مردووە و بێ هـیچ مەیلێکە، لە ژێر تیشکی شـاراوەی عەشـقدا روخساری جیـاواز بەخـۆوە دەگرێـت و بەردەوام دەگـاتە پـلە بەرزەکـانی جـوانی، بەهـۆی گەشەکردنی هێزی عەشقەوە چەندین پلە و پایە لە بەربڵاویی جیهاندا سـاز دەکرێت:

١. بوونەوەرە بێ گیانەکان لە روخسار و مـاددە و کوالیتە پێکهـاتوون، بە هێزی عەشقەوەیە کە کوالیتە پێوەند دەدرێتەوە بە بابەت یان جەوهەری خـۆیەوە، مـاددەی بـێ شـوناس لەگەڵ روخـساری خۆیـدا کـۆدەبێتەوە و بەردەوام لە روخسارێکەوە بۆ ئەویدی دەگوازرێتەوە.

٢. هێزی عەشق خوازیاری تەرکیز و یەکیەتییە، کەواتە جیهـانی نەبـاتی کە زیـاتر لە جیهـانی جەمـادی و کەمتـر لە جیهـانی حەیـوانی خـاوەنی ئەم تەرکیز و یەکیەتییەیە، پێکدێت، لە جیهـانی نەباتییدا نەفسی نەبـاتی خـۆی دەگرێت و سێ کردەوە دەکات:

**ئەلف**- خواردن

**ب**- گەشە

**پ**- سک و زا کردن

ئەم کـردەوانە هـیچ نـین بـێجگە لە دەرکەوتەکـانی عەشـق، خـواردن پێویـستی بە وەرگرتنـی کەرەسـتەی دەرەکیـیە و گـۆڕینی بە کەرەسـتەی

ناوەکی، گەشەکردنی پێویستی بە بردنەسەرەوەی هەماهەنگی نێوان ئەندامەکانی جەستەیە و سک و زا کردن هۆی بەردەوامبوونی مرۆڤە و روخسارێکی دیکەی عەشقە.

٣. لە قۆناغی دواییدا لە جیهانی حەیوانییدا هێزی عەشق تەرکیزێکی زیاتر دەکات و مەزاجی حەیوانی دروست دەبێت و یەکیەتی و گەشەکردن زیاتر لە جاران مسۆگەر دەکرێت. لە جیهانی مرۆییدا ئەم یەکیەتییە بەهێز دەبێت و شعوور دروست دەکات، لە جیهانی بوونەوەرە بەرزترەکان لە مرۆڤیش هەر ئەم عەشقە سرووشتی یان زاتییە لە ئارادایە، هەموو شتەکان بەرەو مەعشوقی یەکەم یان جەمالی تاقانە دەرۆن. بایەخی شتەکان پەیوەستە بە نزیکایەتی ئەوانەوە لەو بنەڕەتە کۆتاییە.

ئیبن سینا لەبەرئەوەی کە پزیشک بوو سەرنجێکی تایبەتی دەدا بە بابەتی نەفس، لە سەردەمی ئەودا بابەتی گواستنەوەی نەفس کەوتبووە بەر سەرنج و ئیبن سینا بۆ ئەوەی درۆبوونی ئەم بابەتە دەربخات دەستی دایە لێکدانەوەیەکی ورد. ئەوەی راگەیاند کە بە دژواری دەکرێت نەفس پێناسە بکرێت بەهۆی ئەوەی کە نەفس لە دەڤەرە جیاوازەکانی هەستییدا بەهێز و شێوازی جیاوازەوە دەردەکەوێت. بیر و ڕای ئەو سەبارەت بە هێزە جیاوازەکانی نەفس ئاوها پیشان دەدرێت:

دەرکەوتە ناخودئاگاکان:

**ئەلف**- چالاکی چەند لایەنە (نەفسی نەباتی): خواردن و گەشە و سک و زا کردن.

**ب**- چالاکی تاک لایەنە لە خۆڕاگریی هاوسانی: گەشەکردن و مەزاج

دەرکەوتە ئاگایانەکان:

**ئەلف**- چالاکی چەند لایەنە (نەفسی حەیوانی):

**لە ئاژەڵە نزمەکاندا:**

١. هێزی درککردن.

٢. هێزی هەژاندن (مەیل بە چێژ و خۆپاراستن لە ژان).

**لە مرۆڤدا:**

١. هێزە ئیدراکییەکان (پێنج هەستی دەرەکی و پێنج هەستی ناوەکی واتە هەستی هاوبەش و ترس و وێنەکردن و زاکیرە و داگیرکردن کە لە شێوازی عەقڵی گەشەکردووی مرۆییدا خۆ دەنوێنن و دەگەنە عەقڵە مەلیکی و پێغەمبەرییەکان).

٢. هێزە هەژێنەرەکان (ئیرادە).

ب- چالاکی تاکلایەنە (رۆحی فەلەکی کە بزووتنەوەیەکی یەک شێوەی هەیە).

ئیبن سینا لە وتاری نەفسدا ئەوەی دەرخست کە نەفسی مرۆیی لە بنەڕەتەوە پاسەوانێکی مادی نییە، نەفس لە رێگەی جەستە یان هێزی جەستەییەوە بیر ناکاتەوە یان خەیاڵی نییە، ئەگەر وەها بوایە پێویستی دەکرد کە نەفس بۆ وێنەکردنی جەستەی پەیوەست بە خۆوە محتاجی جەستەیەکی تر بێت، بێجگە لەوە نەفس خۆی ئاگایی بەسەر خۆیدا هەیە و ئاوها دیارە کە لە زاتی خۆیدا لە هەرجۆرە یارمەتیەکی جەستەیی بێ نیازە.

ئیبن سینا لە پێناو بڕوا بە گواستنەوەی نەفسدا کە پێویستیی بە لەپێشەوەبوون یان یەکەمبوونی نەفس بەسەر جەستەدایە باسێکی تری هێنایە ئاراوە، ئەگەر باوەڕمان بە لە پێشەوەبوونی نەفسی تاک بەسەر جەستەیدا هەبێت، لەوکاتەدا دەبێ ببینین کە لە بنەڕەتەوە یەک نەفس هەبووە یان چەندین نەفس؟ ئەگەر بە ژمارەی جەستەکان بڕوامان بە ژمارەی نەفسەکان هەبێت هەڵەمان کردووە، لەبەرئەوەی کە ژمارەی جەستەکان پێویستی بە هەبوونی هەمان ژمارە روخساری مادییە و دەلالەت ناکاتە ژمارەی نەفسەکان، کەواتە دەبێ بڵێین کە یەک نەفس هەبووە و بە نۆبە بۆتە موڵکی چەندین جەستە، بەڵام هەر لەم بارەشەوە تووشی هەڵە دەبین لەبەرئەوەی لەوەها بارودۆخێکدا بۆ وێنە پێویستە کە دوو کەسی ئەلف یان ب، چوونکە خاوەنی یەک نەفسن کەواتە دەبێ لە زانست و نەزانی یەکتریشدا شەریک بن و راستی لەوەدایە کە نەفس و

جەستە لەیەکتر نزیکن و لە زاتیاندا پێکەوە دژن، لەبەینچوونی جەستە نابێتە هۆی نەمانی نەفس لەبەرئەوەی کە تێکچوون و نەمان لە تایبەتمەندیەکانی شتە بەکۆمەڵەکانە و بۆ شتە ساکار و تاک رەهەند و دابەشنەکراوەکان دروست نییە. لە روانگەی ئیبنی سینادا وەها کە لەپێشەوەبوون یان فەرزکردنی نەفس بەسەر جەستەدا ئەستەمە، مانەوەی نەفس لە دوای مەرگی جەستە بابەتێکی حاشاهەڵنەگرە.

لە نێوان یەکەمین حەکیمە نوێ ئەفلاتوونیەکانی ئێران، تەنها ئیبن سینا بوو کە فکرێکی سەربەخۆی هەبوو، قوتابیەکانی وەک بەهمەن یار، ابوالمامون، مەعسوومی و ابوالعباس و ابن طاهر رێگەی مامۆستاکەیان گرتەبەر و پێویست ناکات فکرەکانی ئەوان باس بکەین.[1]

کاریگەریەتی ئیبن سینا ئەوەندە زۆر بوو کە تەنانەت زەمەنێکی دوور و درێژ پاش ئەویش گۆڕانکاریی یان بەربڵاوترکردنی تیۆرەکانی تاوانێکی گران بوو کە کەسەکان لێی خۆش نەدەبوون.

فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونی ئێران لە گەڕیانی پێشکەوتنی خۆیدا لە دووالیزمی کۆنی ئێرانی واتە دووالیزمی رووناکی و تاریکایی کاریگەریەتی زۆری وەرنەگرت بەڵکو ماوەیەک سەربەخۆ چووە پێشەوە و لە ئاکامدا لە گەڕیانی گشتی فکری ئێرانییدا کە بەرەو تاکایەتی هەنگاوی دەنا، نوقم بوو. کەواتە فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونی تەنیا تا ئەو ڕادەیە کە کاریگەریەتی لەسەر رەوتی گشتی فکری ئێرانی داناوە، پەیوەندی لەگەڵ فەلسەفەی ئێراندا هەیە.

تاکایەتی ئێرانی کە لە سەرەتادا لە دەزگای ئایینی زەردەشتدا دەرکەوت بە هۆی ناکۆکییەکانی ئایینی ئیسلام لە پێشکەوتن بەجێماو لە زووترنی کاتدا بە هێزیکی زیاترەوە هەڵقووڵاو بەسەر هەموو لایەنەکانی عەقڵی نیشتمانەکەی خۆیدا زاڵ بوو.

---

[1] کتێبی بیهقی، کتێبخانەی پاشایەتی بێرلین، بەرگی ٢٨. لەوەدەچێت کە بەسەتی لاهووری کتێبی تتمە صوان الحکمە بێت کە نووسینی ظهیر الدین ابوالحسن بیهقی بێت کە لە هیندوستاندا بەناو تاریخ الحکماء الاسلام بڵاو کراوەتەوە.

زەینـی ئێرانـی لە پـاش ئەوەی کە لەگەڵ کەش و هەوای سیاسـی ئیـسلامدا ئاشنا بوو، ئـازادی دەروونـی خـۆی دۆزیەوە، پـاش ئەوە بـوو کە لە جیـاتی رامان سەبارەت بە بوونی خۆی و ئەو ڕووداوانەی زەمەن ڕێگەیەکی تری گرتە بەر و لە پانتای راستییەکان خۆیکێشایەوە، زەینی ئێرانی کە ماوەیەک لە دنیای عەینییدا بزر بووبوو بە چاولێکردنی فەلسەفەی یۆنانی دەستیکرد بە گەڕان بە دوای هزردا و خۆی بە حەکەمـی حەقیقەت بینی. لەم ڕەوتەدا بـوو کە زەینخـوازیی پێکهـات و لەگەڵ دیکۆمێنـت و دەرکەوتە سـەپاوەکانی جیهـانی دەرەکییـدا تووشـی گرفـت بـوو، بێگومـان وەهـا سـەردەمێک کە لە مێـــژووی فکـــری هەر هـــۆز و نەتەوەیەکـــدا روو دەدات، ســـەردەمی هزرخـوازی، شـک و گومـانکردن و عیرفـان و ئیرتیـدادە و لەو مـاوەیەدا زەینـی مـرۆڤ بەهـۆی تێڕامـان لەنـاو خۆیـدا، ئـاوڕ لە پێـوانە دەرەکیەکـانی حەقیقەتناسیی ناداتەوە.

لە رۆژگاری دەسـەڵاتداریی حـاکمە ئەمەوییەکانـدا، ئێرانییەکـان هەوڵیـان دا خۆیان لەگەڵ بارودۆخی نوێدا بگونجێنن، بەڵام بەهۆی زاڵبوونی حـاکمە عەباسـییەکان و پەرەسـەندنی فەلـسەفەی یۆنـاییەوە هێـزی عەقڵـی ئێرانـی دیسان هەڵقولاو لە هەمـوو دەڤەرەکانی ئەندێشە و کـرداردا بە شـێوەیەکی سەرسـوڕهێنەر خـۆی نوانـد. ئێرانیەکـان فەلـسەفەی یۆنانیـان بە شـادییەکی زۆرەوە موتـاڵا کـرد و وەریـانگرت و بە شـــەوقی هزرێکـی نـوێ کە لەم ڕێـگەوە پەیـدایان کـرد بـێ وەسـتان دەسـتیان دایە رەخـنە لە تەوحیـدی ئیـسلامی، بەرلەوەی کە عەقڵـی وشـک لە دەمەقـاڵەی نـاکۆکیە ئایینیەکـان وەرەز ببێـت و خـۆی بخـاتە کونجێـک و تیـۆریەکی سـازگار پێکبهێنێـت، تئۆلـۆژی واتە ئیلاهیـات رەنگی فەلـسەفی بەخـۆوە گـرت. تئۆلـۆژیەک کە بە هێزی دەمارگرژی ئایینیەوە گیانێکی تازەی گرتبوو.

لەسەرەتای سەدەی دووهەمی کۆچیدا، واصل بن عطا، قوتـابی حەسـەن بەسـری کە یەکێـک بـوو لە زانایـانی بەناوبـانگی کەلام، ئـایینی مـوعتەزیلەی

دامەزراند کە هەمان سیستمی هزرخوازیی جیهانی ئیسلامییە، ئەم ئایینە کە بەرجەستەترین بزووتنەوەی فکری ئەو سەردەمە بوو، سەرەتا هەندێک لە بیرمەندە توندەکانی هەژاند، بەڵام هەرزوو بە هۆی دەمەقاڵەی فەلسەفی نێوان بەغداد و بەسرە لەو گرۆتینە کەوت. لەو سەردەمەدا شاری بەناوبانگی بەسرە بە بەرەکەتی بارودۆخی بازرگانی خۆی بووبوو بە پانتایی فکرە جیاوازەکان وەک فەلسەفەی یۆنانی و شکخوازی و مەسیحیەت و باوەڕەکانی بودا و ئایینی مانەوی، ئەم شارە خۆراکی مەعنەوی دەگەیاندە ئەو زەینانەی کە بە شوێن دۆزینەوەی حەقیقەت بوون و شوێنیکی باش بوو بۆ هزرخوازیی ئیسلامی، بەراستی سەردەمێک کە ئیش پیتا Spitta بە سەردەمی سریانی مێژووی ئیسلامی ناو دەبا، دەورەی نوکتەی فەلسەفی نییە، بەڵام بە دەستپێکی زەمەنی پەرتەوازە بوونی ئێرانیەکان، خوازیارە راستییەکانی فەلسەفەی یۆنانی بە قووڵایی سەبارەت بە ئاینی خۆیان دەستیان کرد بە رامان و بیرمەندە ئیعتزالیەکان بەرەبەرە هاتنە ناو بواری فەلسەفەی سەرتر.[1]

ئەو بابەتەی جێگەی سەرنجی ئێمەیە لایەنی فەلسەفی فیرقەی موعتەزیلەیە، هەربۆیە ئیشمان بە مێژووی زانستی کەلام نییە لای موعتەزیلە و تەنها فکری فەلسەفی ئەو فیرقەیە سەبارەت بە مادده و خوا دەخەینە بەر باس.

حەکیمە ئیعتزالیەکان بە پاساوهینانەوەیەکی ورد و پڕ لە موناقەشە کە ئیمتیازی سەرتری ئەوان بوو بەرامبەر بە موسوڵمانە رووکەشیەکان، هاتن باسی تەوحیدیان هێنایە ئاراوە. بە باوەڕی ئەوان سیفەتەکانی خوا زیاترنین بەسەر زاتی ئەودا بەڵکو هەمان زاتی ئەون. بەم پێیە لە روانگەی موعتەزیلەوە

[1] حەکیمە موعتەزیلەکان تایبەت بە وڵاتە جیاوازەکان بوون، بەڵام زۆربەیان یان بنچینەیەکی ئێرانیان هەبوو یان لە ئێراندا دەژیان. واصل بن عطا کە بە دارێژەری ئەم فیرقەیەی دەزانن، خۆی ئێرانی بووە.

سیفاتی خوایی بوونێکی سەربەخۆیان نییە بەڵکو هەروەک بوونی موجەڕەدی خواییین. ابوالهذیل دەڵێت: خوا زانا و گشت توانا و زیندووە و زانایی و توانایی و ژیانی ئەو ڕێک هەمان زاتی ئەون.(١) یوسف البصیر بۆ ڕوونکردنەوەی یەکبوونی زاتی خوا باس لە پێنج بناغە دەکات:(٢)

١. فەرزی بوون بەشی لێک نەکراوەیە و عەرز پێویستە.

٢. فەرزی هەبوونی خوڵقینەر پێویستە.

٣. فەرزی بوونی ئەحوالاتی خوا پێویستە.

٤. ئەو سیفەتانەی شایستەی خوا نین، قبووڵ نەکراون.

٥. یەکبوونی خوا بە پێچەوانەی زۆربوونی سفەتەکانی ئەو قبووڵکراوە.

چەمکی یەکبوونی خوا تووشی گۆڕانکاریی بوو و لە ئاکامدا بەهۆی معمر و ابوهاشم بە شێوازی بابەتێکی تاقانە کە بەدوورە لە هەرجۆرە نیسبەتێک، ئەمان ڕایانگەیاند کە ناکرێ زانست بۆ خوا بە شتێکی هەڵگیراو بزانرێت، لەبەرئەوەی لەهەر حاڵەتێکدا زانستی خوا دەبێت شتێک بێت لە زاتی خوادا و قبووڵکردنی ئەم خاڵە یان یەکگرتنی عالەم و مەعلوومی پێویستە کە ئەمە باتڵە یان پێویستی بەوە هەیە کە لە زاتی خوادا دوو دەستەیی هەبێت کە ئەمەش نادیارە. ئەحمەد و فەزڵ، قوتابیەکانی ابواسحاق نظام ئەم دوویەتیەیان ناسیەوە و وتیان کە دوو خوڵقێنەری ڕەسەن بوونی هەیە: یەکێکیان بنەرەتێکی قەدیمە واتە خوا و ئەویدی بنەرەتێکی دروستبوو واتە کەلیمەی خوا یان عیسا مەسیحە. معمر جەختی کردە سەر یەکبوون و بیروڕاکانی لەوەبەدوا کەوتە بەر سەرنجی سۆفیەکانی ئێران. بەم شێوە دەبێ قبووڵ بکرێت کە هەندێ لە هزرخوازە ئیعتزالیەکان کەم تا کورتێک بە شێوازی نائاگایانە تا سنووری گشت خوایی چوونە پێش و بەو پێناسەی کە لە خوا کردیان و بەو هەوڵەوە کە

[1] ابوالفتح تاج الدین شهرستانی، الملل والنحل، پێداچوونەوەی کورتەن، لەندەن ١٨٤٦، ل٣٤.

[2] Frankel: Ein Mutazilatischeher Kalan,Wien, 1872, p. 13

بۆ ناوەکی کردنی یاسای ڕەهای دەرەکی کردیان ڕێگەی گشت خواییان بۆ سەردەمی دوایی کردەوە.

گرنگترین خزمەتی هزرخوازەکان بە فەلسەفەی ڕەها دارشتنی تیۆریەک بوو سەبارەت بە مادده کە پاشان لە دەستی دژکارانی ئەواندا واتە ئەشعەریەکان تووشی گۆڕانکاریی بوو و لەگەڵ خواناسیی ئەشعەریەکاندا یەکی گرت. ابواسحاق نظام، لە بنەڕەتەوە سرووشتی بە گەریانیکی ڕێک و جەبری دەزانی. جاحظ هەروەها حەزی بە سرووشت خوازی دەکرد و ئیرادەی بە شێوەیەکی سلبی پێناسە کرد[1].

بە گشتی هەرچەند هزرخوازەکان دەستیان لە چەمکی مەشیەتی خوایی نەشۆرد بەڵام هەوڵیان دا کە بوارێکی قوڵ بۆ سەربەخۆیی یەکە بە یەکەی نموده سرووشتیەکان بدۆزنەوە، ئەم بوارە مادده بوو. هەروەک چۆن ابواسحاق نظام باسیکردووە مادده دابەش دەکرێت و ئەم دابەشبوونە کۆتاییەکی نییە. لە نێوان جەوهەر و عرض دا هیچ جیاوازیەک لە ئارادا نییە. بوون یان وجود کوالیتەیەکە کە بە مەشیەتی خوا بەشە جیانەکراوەکانی ماددەی لەخۆگرتووە. ئەم بەشە جیانەکراوانە بەردەوام لەئارادا بوون، بەڵام لە حاڵەتی بەر لە بوون واتە بەر لەوەی کە کوالیەتەی بوون وەرگرن هێزی ئیدراکیان نەبووە. ابن حزم نووسیویەتی کە بەپێی باسێکی یەکێک لە شێخەکانی موعتەزیلە واتە محمد بن عثمان، بەشی دابەش نەکراو یان پاژە بەر لەوەی کە شکۆی بوون وەربگرێت، شتێکە بەدەر لە حەرەکە و بێ جووڵەیە و بە مەخلوقیش ئەژمار ناکرێت. کۆیەک لە چییەتیەکان واتە تام و بۆن و ڕەنگ کە لە خۆیاندا بە ئیمکانیاتی مادی ناژمێردرێن دەبنە هۆی پێکهاتنی جەوهەر، ڕۆح بابەتێکی ناسکە لە جنسی مادده و چالاکیە فکریەکانیش بزوتنی زەینن، خوڵقاندن تەنها وەدیهاتنی ئیمکانیاتی بەر لە بوونە، لە ئیماژی هەر شتێکدا، تاکبوونی ئەو شتە واتە

[1] ابوالفتح تاج الدین شهرستانی، الملل والنحل، پێداچوونەوەی کورتەن، لەندەن ١٨٤٦، ل٣٨.

ئەوەی کە نیسبەتی هەیە لەگەڵ بابەتەکەدا، هۆی سەرەکی نییە. * جیهان کۆمەڵێکە لە شتەکان کە روخساری دەرەکیان هەیە و شیاوی درککردنن بەڵام جیهان سەربەخۆیە لە ئیدراکاتی ئێمە. حەکیمە موعتەزیلەکان کە باسیان لە هەموو بابەتە وردەکانی فەلسەفە کردووە بۆ گەیشتن بە مەبەستی ئایینی، خوایان بە یەکەیەکی رەها زانیوە کە بە هیچ شێوەیەک قبووڵی ژمارەی تر ناکات و کەواتە لە زیادبوونی هەست پێکراو {نەکراو} دوور و رەهایە. چالاکی خوا تایبەت بووە بەوەی کە بەشە دابەش نەکراوەکان شیاوی درککردن بکات. تایبەتمەندیەکانی بەشە جیانەکراوەکان لە زاتی خۆیانەوە دێت. هەروەک چۆن کەوتنەخوارەوەی بەردێک تایبەتمەندیەکە لە ناو خودی بەردەکەدا.

عطار بصری و بشر بن المعتمر وتیان کە خوا رەنگ و درێژایی و پانایی و تام و بۆنی نەخوڵقاندووە، بەڵکو ئەمانە بەرهەمی چالاکی شتەکانن.[1] خوا تەنانەت ژمارەی شتەکانی جیهان نازانێت. بشر تایبەتمەندیەکانی شتەکانی بە چەمکی "لەدایکبوون" یان کردەوەی بەرامبەری شتەکان روون کردەوە، کەواتە ئاشکرایە کە هزرخوازە ئیعتزالیەکان لە باری فەلسەفییەوە ماددەخواز بوون و لە باری ئایینیەوە باوەڕیان بە خوایەکی پەیوەست بە سرووشتەوە بوو.

فیرقەی موعتەزیلە جەوهەر و بەشی دابەش نەکراوی بە یەکێک زانیوە. جەوهەر بەشێکی جیانەکراو یان زەڕەیەکە کە فەزا دەگرێتەوە و بەدەر لەم تایبەتمەندیە خاوەنی لایەن و هێز و بوونیکە کە دەبێتە هۆی بەکردەبوونی زاتی ئەو، زەڕە شێوازێکی چوارگۆشەی هەیە، لەبەرئەوەی کە ئەگەر شێوازێکی خڕی هەبێت یەکگرتنی ئەم پاژە جیاوازانە ئەستەم دەنوێنێت.[2]

---

1 ابی محمد علی حزم، کتاب الفصل فی الملل و الاهواء ا النحل، ج چهارم، ل ١٩٤-١٩٧

2 لە بارەی چۆنیەتی پاژە یان زەرەوە، بەهرەیەکی زۆرم لەم کتێبە وەرگرتووە: المسائل فی الخلاف بین البصیرین والبغدادین فی الکلام فی الجوهر، بەرهەمی ابو رشید سعید نیشابوری.

حەکیمە زەڕەخوازەکانی ئیعتیزالی سەبارەت بە زاتی زەڕە یان بەشی جیانەکراوە جیاوازی بیروڕایان هەبوو، هەندێکیان باوەڕیان بە یەکسانی زەڕەکان هەبوو، بەڵام ابو القاسم کەعبی بەڵخی، زەڕەکانی هەم بە هاوشێوە و هەم بە نایەکسان دەزانی، بەو مانایەی کە زەڕەکان لە یەکتر دەچن، بەڵام ئەم هاوشێوەییە لە گشت لایەنەکانەوە نییە. ابو القاسم بە پێچەوانەی (نظام)ەوە، زەڕەکانی بە هەرمانی واتە نەمر دەزانی و باسی لەوە کرد کە زەڕە خاوەنی دەستپێکی زەمەنییە، بەڵام بەتەواوەتی لە ناو ناچێت، لەبەرئەوەی کە مانەوە هۆی درێژەدانی بوونە و درێژەدانی بوون تایبەتمەندیەکی وجودی نوێ نییە. لە روانگەی ابو القاسمەوە هەبوونی زەڕە و مانەوەی بەرهەمهاتووی چالاکی ئیلاهییە، بەڵام ئیمکانی ئەوە هەیە کە هەندێ لە زەڕەکان لە بنەڕەتەوە بە سیفەتی مانەوە نەخوڵقابێتن. ابو القاسم بوونی فەزای ناوبژیوانی زەڕەکان بە ئەستەم نازانێت و بە پێچەوانەی دیکەی نوێنەرەکانی فیرقەی موعتەزیلە باوەڕی بەوە هەبوو کە زەڕە یان چیەتی ناتوانێت لە حاڵی نەبووندا بە شێوازی چییەتی بمێنێتەوە. ئەگەر بێجگە لەوە ڕایەکیترمان هەبێت تووشی پارادۆکس دەبین. چییەتی بە حوکمی ئەوەی کە سیفەتی بوونە، ئەگەر باس لەوە بکەین کە چییەتی لە حاڵەتی نەبوونیشدا هەر خۆیەتی ڕێک وەک ئەوەیە کە بوونەوەرێک لە حاڵەتی نەبووندا بە زیندوو بزانین. ئەم باوەڕەی ابو القاسم هاوشێوەیەتی هەیە لەگەڵ تیۆری ناسینی ئەشعەرییەکان کە لە کاتی خۆیدا زەربەتێکی قورسی دابوو لە ماددەخوازیی موعتەزیلە.

## ٢. بزووتنەوە فکرییە هاوکاتەکان

**شکخوازیی، تەسەوف، ئایینی ئیسماعیلی**

لەهەر سەردەمێکی فەرهەنگی پڕ لە گڕ و تیندا چەندین بزووتنەوەی فکری لەلای یەکترەوە پەیدا دەبن، هەروەک لە سەردەمی شکۆی فیرقەی موعتەزیلەدا چەندین گەڕیان لە بازنە فەلسەفی و ئایینیەکاندا پەیدا بوو، بە کورتی ئاماژەیەکیان پێ دەکەین:

**١. شکخوازیی:**

بەهۆی شێوازی جەدەلی هزرخوازەکانەوە بە پێویست جۆرێک لە شکی فەلسەفی دەرکەوت، کەسانێک وەک ثمامە بن اشرس و جاحظ کە بە هزرخواز دەناسران بە راستی لە ریزە شکخوازەکاندا بوون. جاحظ باوەڕی بە خوایەکی پەیوەست بە سرووشتەوە هەبوو، وەک دیکەی پیاوانی رۆشنبیری سەردەمی خۆی بە هیچ شێوەیەک لە ئەهلی کیتاب نەدەچوو.

جاحظ بەرامبەر بە وردبینییە فەلسەفیەکانی سەردەمی خۆی شۆڕشی کرد و هەوڵی دا کە ئیلاهیات بەربڵاوتر بکات و بیگەیەنێتە دەستی خەڵکی سادە و ساکار کە نەیاندەتوانی لە بابەتە ئایینیەکاندا شارەزا بن.

**٢. تەسەوف:**

دۆزینەوەی ئیپیستمۆلۆژی کە سەرتر بێت لە ناسینی ئاسایی، یەکەمین جار لە لایەن ذوالنون رەوتێکی رێکی وەرگرت، بەرەبەرە قووڵاییەکی زیاتری پەیدا کرد و بە شێوازی سیستمێکی دژە قوتابخانەیی واتە دژە سکۆلاستیک دەرهات و بەرامبەر بە سیستمی وشکی عەقڵی ئەشعەریەکان راوەستا. پێناسەکردنی ئەم سیستمە لە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا دێت.

**٣. ئایینی ئیسماعیلی:**

ئەم ئـایینە کە بـووە هـۆی زینـدووبوونەوەی دۆکیـۆمێنتە ئایینیەکـان لە بنەڕەتەوە ئێرانی بوو، ئیسماعیلیان لە جیاتی ئەوەی کە ئـازادبیریی تێکەڵ بە ئیرتیدادی سەردەمی خۆیان سەرکوت بکەن، هەوڵیاندا کە ئایینی لەگەڵدا ئاشـت بـکەنەوە. هەربـۆیە ئـایینی ئیـسماعیلی لەگەڵ ئـازادبیریی ئەو سـەردەمەدا پەیوەنـدییەکی قـووڵی هەبـوو و لە موجـادەلە کەلامیەکـانیش دوورەپەرێـز بـوو. شـێوازە ریکلامیەکـانی ئیسماعیلیەکان لە شـێوازەکانی فیرقە ئیخوانی سەفا دەچوو، دیارە ئەم هاوشـێوەییە پیشاندەری هەبوونی پێوەندی لە نێوانی ئەم دوو فیرقەدایە.

خـوازە و سـەرچاوەی ئـایینی ئیسماعیلی هەرچـی بێت ئەمە راسـتیەکی حاشـاهەڵنەگرە کە ئیـسماعیلییەکان لە بەرامـبەر شـێوازە جیاوازەکـانی بیرکـردنەوەدا پەرچەکرداریـان نوانـد و هەربـۆیە لە فەرهەنگـی ئیـسلامییدا گرنگـایەتیەکی زۆریـان هەیە. بێگومـان لەهەر کـۆمەڵگەیەکی پـڕ گـڕوتین و زینـدوو، تیـۆرگەلی فەلـسەفی و ئـایینی جۆراوجـۆر پێکـدێت، بەڵام چونکـە گـشتخوازی فکـری لە روانـگەی ئـایینەوە بـابەتێکی مەترسـیدارە و بە زووتـرین کـات پەرچەکردارێـک لە کـۆمەڵگەدا سـەرهەڵدەدات و هەنـدێک بەرهەڵست پەیدا دەبێت. بۆ وێنە لە ئەوروپای سەدەی هەژدەهەمـدا فیخـتە کە لەسەرەتادا چییەتی ماددەی خستبووە بەر لێکـۆڵینەوە، خـۆی لە ئاکامـدا گەیشتە چەند خـوایی. لە بەرامبەردا ئاگۆسـت کۆنت کە هەمـوو لێکۆڵینەوە لاهوتییەکـانی لادابـوو، مەعریفەتـی سنووردار کردبـوو بە ئیدراکی هەسـت ئـامێز. شـلایرماخر هێـزی عەقڵـی لە رێـگەی ئیمانـدا دامرکانـد. یـاکونی بـۆ گەیشتن بە مەعریفەت بـابەتێکی سـەرتر لە عەقڵـی دۆزیەوە و دومێستێر و شـلەگل، پـاپی مەسـیحییان بە بـوونەوەرێکی بـێ تـاوان زانـی و کردیـانە پاڵپـشت. لە جیهـانی ئیسلامیـشدا ئیـسماعیلییەکان و دیـکەی خوازیـارانی ئیمـامەت، سـەبارەت بە بـابەتی ئیمـامەت وەک دۆمێستێر و شـلەگل دووان.

بەم حـاڵەوە ئیـسماعیلیەکان لە هەمـان دۆخـی وابەسـتەیی بەو بـابەتە جێگەیەکیان بۆ ئازادبیریی هێشتەوە.

کەواتە ئاشکرایە کە ئـایینی ئیـسماعیلی دەبێ بە یەکێک لەو لایەنـانەی خۆڕاگریی بیرمەندە سەربەخۆکانی ئێران بزانین کە دژ بە ئامـانجە ئـایینیی و سیاسیەکانی ئیسلام دەستیان پێکردبوو.(١)

ئەم ئایینە لە بنەڕەتدا یەکێک بوو لە روخسارەکانی مەزهەبی شیعە، بەڵام بەهۆی عبدالله بن میمون، لە سنوورەکان رزگاری بوو. ئەم پیاوە سەیرە کە لەگەڵ ابوالحسن ئەشـعەری دوژمنـی گەورەی ئازادبیرییـدا هـاوچەرخ بـوو، هەروەهـا بانگەشـەی بـۆ خولەفـای فـاتمی میـسر دەکـرد، پلانێکـی گەورەی دارشت، تان و پۆ رەنگاورەنگەکانی رست و سیستمێکی وەهـای سازکرد کە بە هۆی رەنگە جیاوازەکان و رەمزاویی بوونەکەی و هەروەهـا بەهرەیەک کە لە فەلسەفەی فیساغۆریسی بردبووی، لە لایەن زەینی ئێرانییەوە پەسـەند کرا. وەک ئیخـوان سـەفا کە هەمـوو فکـرە بارزەکـانی سـەردەمی خـۆی لە ژێـر پەردەی ئـایینی ئیمـامەت کـۆکردەوە و هەروەهـا مەزهەبـی ئازایـانەی خـۆی لەگەڵ ئەم بابەتانە ئـاوێتە کرد و ڕازاندیەوە؛ فەلسەفەی یۆنـانی، مەسـیحیەت، ئـایینی مـانەوی، فکـرە موعتەزیلیەکـان و تەسـەوف و بیروڕاکـانی مـورتەدە ئێرانیەکـان. بەپێـی ئەم مەزهەبە، ئیمـام یـان رێبەری ئیـسماعیلییەکان، عەقڵـی گشتی و دیارە و بەرەبەرە لایەنەکانی حەقیقەت بۆ خەڵکی سـەرەتایی ئاشـکرا دەکـات. عەقڵـی گـشتی لە هەر سـەردەمێکدا بەپێـی گەشـەی فکـری خەڵـک لە دەرەجەیەکدا لە تاکی ئیمامدا خۆی دەردەخات.

لە دەرکەوتـن و گۆڕانکـاری مەزهەبـی ئیـسماعیلییەکان بـاش دیـارە کە گەڕیانی ئازادبیریی لە ترسـی ئەوەی کە نەوەک لە رێگەی کـامڵبوونی رۆژ لە دوای رۆژی خۆیدا تووشی نەمان بێت، بە شوێن دۆزینەوەی پێگەیەکی

---

[1] ابی محمد علی حزم، کتاب الفصل فی الملل و الاهواء والنحل، بـوونی فیرقە مـورتەدە ئێرانیەکانی بە بەرهەمـی خەبـاتی بەردەوامـی ئێرانیەکـان دەزانـی کە خوازیـاری تێکشکاندنی هێزی عەرەبەکان بوون هەڵبەت لە رێگەی ئاشتیخوازانەوە.

پەتەودا گەڕا. پێکەنینی چارەنووس لەوەدابوو کە پێگەیەکی وەهای پەیدا کرد کە یەکسەرە بوون و ژیانی خستە مەترسییەوە، ئایینی ئیمامەت کە هێشتا لە گرۆتینەکەی نەکەوتبوو، ئازادبیریی سەردەمی وەک منداڵێکی بێ باوان گرتەخۆ و بەخێوی کرد و بەم کارەوە گشت مەعریفەی رابردوو و ئێستا و داهاتووی بۆ خۆی مسۆگەر کرد.

بەداخەوە پەیوەندی فیرقەی ئیسماعیلی بە سیاسەتی ئەو سەردەمە بۆتە هۆی سەرلێشێواویی زۆرێک لە توێژەران. ئەوان و هەروەها مەک دۆنالد (Macdonald).

ئایینی ئیسماعیلی وەک پیلانێکی ئێرانی بەهێز زانیوە بۆ لەناوبردنی هێزی سیاسی عەرەب. دەزگای ئایینی ئیسماعیلیان کە خاوەنی هەندێک لە گەورەترین مێشکەکان و سافترین دڵەکان بوو بۆ سووکایەتی پێکردن بە فیرقەیەکی مرۆڤ کوژی دڵڕەش زانیوە کە بەردەوام بە شوێن ڕاودا دەگەڕێن. کاتی باسکردن لە کارەکانی ئیسماعیلییەکان دەبێ لە بیرمان بێت کە ئەمان لە بەرامبەر دڕندانەترین ئازارەکاندا بوون و ناچار کەوتنە داوی توندوتیژییەوە. لە کۆمەڵگە سامیەکاندا کوشتنی مرۆڤ بە ناوی ئایینەوە بەدەر لە هەر جۆرە بەرهەڵستکردنێک بوو، تەنانەت بە مەشروع دەزانرا. تەنانەت لە ئەوروپا پاپاکان هەتا سەدەی شانزدە مرۆڤ کوژیە ترسناکەکانیان وەک کوشتاری رۆژی جیژنی بارتەلمی Barthelemy پەسەند دەکرد.

تەنها لە رۆژگاری ئێستادایە کە هەرجۆرە مرۆڤکوژیەک چ ئایینی بێت و چ غەیرە ئایینی بە تاوان دەناسرێت. کەواتە رەوا نییە جیلە پێشووەکان بە پێوەرە ئەخلاقیەکانی ئەمڕۆ بخەینە بەر دادگا.[1] بزووتنەوەیەکی ئایینی ئەوەندە مەزن وەک نەهزەتی ئیسماعیلیی بناغەکانی ئیمپراتۆریەکی بەرینی خستە لەرزە و بە هەموو ئەو ئیهانە کردن و بوختان و ئەشکەنجە

[1] ابوالفتح تاج الدین شهرستانی، الملل و النحل، پێداچوونەوەی کورتەن، ١٨٤٦، ل١٤٩.

جیاوازانەوە دیسان سەربەرز بوو لەو گشت تاقیکردنەوە بێتە دەر و بۆ ماوەی چەندین سەدە پاڵەوانی زانست و فەلسەفە بوو، وەها بزووتنەوەیەک ناکرێ تەنها لەدایکبووی پیلانێکی سیاسی ناسەقامگرتوو بێت. ئەم ئایینە، ئایینێکە کە لەسەردەمی ئێستاشدا هەرچەند لەو تینە سەرەتاییەی خۆی بەتاڵ بووە، بەڵام کەماڵی خوازیاری ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی هیند و ئێران و ئاسیای ناوەڕاست و سوریا و ئەفریقایە و گەیشتووەتە فکری بابیەوە کە لە مەرامە سەردەمیەکانی ئێرانە.

بگەڕێینەوە بۆ فەلسەفەی ئیسماعیلی، بیرمەندەکانی ئەم مەزهەبە چەمکی ئولوهیەتیان لە موعتەزیلیە نوێکان وەرگرت، بەپێی راهێنانەکانیان خوا، یان بنەڕەتی کۆتایی جیهان، قبووڵی سیفەت ناکات و زاتی خوا نیسبەت وەرناگرێت. کاتێک کە سیفەتی "قادر"ی بۆ دادەنێین هەر ئەمە رادەگەیەنین کە ئەو بەخشندەی هێزە و کاتێک سیفەتی "قەدیم"ی بۆ ناو دەبەین مەبەستمان مێژووی وشەی خوا یان بە وتەی قورئان "عالم امر"ە، کە لە بەرامبەر عالەمی خوڵقاو "محدث" دەوەستێت. گشت پارادۆکسەکان لە زاتی ئولوهیەتدا دەسڕدرێنەوە و گشت دژەکانیش لەوێوە دێن. ئیسماعیلیەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە بەم شێوازە گرفتی گرنگی ئایینی زەردەشتیان چارەسەر کردووە، بیرمەندە ئیسماعیلییەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی وەڵامێک بۆ پرسیاری "کثرت" چییە؟ کەڵکیان وەرگرت لە بابەتێک کە بە باوەڕی ئەوان لە چەمکە سەرەتاییەکانی فەلسەفەیە. ئەم بنەڕەتە بەم شێوەیە کە: لە یەک تەنیا یەک دەبێتەوە، واتە "قاعدە الواحد" بەڵام یەکێکی نوێ کە لە یەکێکی کۆن بەرهەم دێت بە تەواوەتی لە یەکە کۆنەکە جیاواز نییە بەڵکو هەمان یەکە کۆنەکەیە کە تووشی گۆڕانکاریی بووە و نوێ بووەتەوە. کەواتە دەبێ ئەوە قبوڵ بکەین کە یەکیەتی سەرتر تووشی گۆڕان بووە و بە شێوەی عەقڵی یەکەم یان عەقڵی گشتی دەرهاتووە و پاشان بە گۆڕانکارییەکی تر نەفسی گشتی

پێکهێناوە. نەفسی گشتی بە حوکمی زاتی خۆی خوازیاری ئەوە بوو کە لەگەڵ یەکیەتی سەرتر یەکبگرێت، کەواتە بزووتنەوە و جەستەیەک کە خاوەنی هێزی حەرەکە بێت بوون بە پێویستی، نەفسی گشتی بۆ گەیشتن بە ئامانجی خۆی ئەفلاکی خولڵقاند کە لە لایەنی دڵخوازی ئەودا حەرەکەیەکی بازنەیی هەبوو، هەروەها دەستی دایە خولڵقاندنی توخمگەلێک کە ئاوێتەی یەکتر بوون و جیهانیان پێکهێناوە، جیهان دەرکەوتەی زۆرینەیە و نەفسی گشتی هەوڵدەدات کە لە نێوان ئەم زۆرینەدا تێپەڕ بێت و بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی سەرەکی خۆی، نەفسی پاژەیی یان ورد کۆکراوەی جیهانە و تەنها بۆ پەروەردەکردن و پێشکەوتن پێکهاتووە. عەقڵی گشتی جاروبار لە کەسایەتی ئیمامدا خۆی نیشان دەدات و ئیمام نەفسە وردەکان بەپێی تاقیکردنەوە و گیرایی ئەوانە، نورانی دەکات و بەرەبەرە لە نێوان زۆرینەوە ڕێگە بۆ جیهانی یەکیەتی هەرمانی دەکاتەوە. لەوکاتەدا کە نەفسی گشتی بگاتە تەشقی خۆی یان باشترە وابڵێین کە بگەرێتەوە بۆ قووڵایی خۆی، دابڕان و پەرتەوازە بوون دەست پێدەکات. ئەو وردیلانەی کە جیهانیان دروست کردووە لە یەکتر جیا دەبنەوە و توخمگەلێک کە پەیوەستن بە چاکەوە دەگەڕێنەوە بۆ حەق، یان خوا کە نوێنەری یەکیەتییە و توخمەکانی پەیوەست بە خراپە، پەیوەندیان دەبێت بە ناڕاستی یان شەیتان کە دەرکەوتەی زۆرینەیە.

ئەمە بوو کورتەیەک لە فەلسەفەی ئیسماعیلی کە بە وتەی شەهرستانی ئاوێتەیەکە لە بیروڕا مانەویەکان و فکرە فەلسەفیەکانی ئەو سەردەمە. ڕێبەرە ئیسماعیلییەکان پاش ئەوەی کەسنای سەرەتاییان سەبارەت بە ئیمانی دێرین دەخستە شک و گومانەوە، نەرم نەرم فەلسەفەی خۆیان دەگواستەوە بۆ ئەم کەسانە و لە ئاکامدا دەیانگەیاندنە قۆناغی رزگاربوونی مەعنەوی. ئیماندارە ئیسماعیلییەکان لەم قۆناغەدا روخسارە موختارە ئایینیەکانیان تەرک دەکرد و ئایینی رووکەشییان بە دەزگایەکی ئاخندراو

له درۆی سپی دەزانی، روانینی فەلسەفی ئیسماعیلی لەدایکبووی یەکەمین هەوڵێک بوو کە بۆ ئاوێتەکردنی فەلسەفە لەگەڵ جیهانبینی رەسەنی ئێرانی روویدا. ئیسماعیلییەکان لە ژێر تیشکی فەلسەفە تەندراوەکەی خۆیاندا هەوڵیاندا ئیسلام پیشان بدەنەوە و لەم رێگەدا بە شێوازێک کە پاشان لە لایەن سۆفیەکانەوە پەسەند کرا دەستیان دایە لێکدانەوەی قورئان.

له سیستمی فکری ئیسماعیلییەکاندا ئەهریمەنی زەردەشت خولقێنەری شەیتان روخساری خراپیەکان نییە، بەڵکو توخمێکە کە دژ بە یەکیەتی سەرەتاوە هەڵدەستێت و بە تێکشکاندنەکەی گشت پارچەیی جیهانی دەرکەوتە ساز دەکات. ئەم بنەڕەتە پڕ لە شەڕو موناقەشە کە بەشێکە لە زاتی یەکیەتی سەرەتا و دەرخەری گشت چەشنی جیهانی هەستپێکراوە، بەرەبەرە تووشی گۆڕانکاریی بوو. لە سەدەی هەشتی کۆچییدا بە هۆی فیرقەی حروفییەوە کە پەیوەست بوو بە ئایینی ئیسماعیلییەوە لە لایەکەوە لەگەڵ تەسەوفدا و لەلایەکیترەوە لەگەڵ تەسلیسی مەسیحییدا بەرامبەر بوو. حروفیەکان لەسەر ئەو بارەوە بوون کە وشەی "کن" واتە ببە، وشەی کەونی خوایە و هەرچەند خۆی نامەخلوقە، روخساری دەرەکی پەیدا دەکات و دەگاتە خەڵک، بەڵام نابێ فەرامۆشی بکەین کە لە وشەوە رێگەیەک نییە بۆ ناسینی زاتی ئولوهیەت لەبەرئەوەی ئولوهیەت لە دەستێوەردانی درککردنی هەستەکانەوە بەدوورە.(١) کەواتە ئەمە وشە بوو کە بۆ دەرخستنی "باوک" لە منداڵدانی "مریەم"دا بووە جەستە. گشت جیهان سەرانسەر دەرکەوتەی 'وشە'ی خوایە و خوا علوولی کردۆتە ناو "وشە"وە. گشت دەنگەکانی جیهان لە خوادایە و هەر زەرەیەک سرروودی ئەو دەچرێت. هەرچی هەیە، مانەوەیە. ئەوانەی کە خوازیاری دۆزینەوەی حەقیقەتی کۆتایین دەبێ موسەما لە ناو ئیسمدا بدۆزنەوە، لەبەر ئەوەی ئیسم لە هەمان حاڵدا هەم ناوەرۆکی خۆی دەشارێتەوە و هەم پیشانی دەدات.

---

[1] ابوالفضل استر آبادی، جاویدان کبیر، کتێبخانەی کەمبریج، بەرگی١٤٩ الف

## ٣. ئایینی ئەشعەری
## یان پەرچەکردارێك لە بەرامبەر هزرخوازییدا

بــزووتنەوەی هزرخــوازیی پــشتیوانی لە لایەن یەکەمــین خەلــیفە عەباســییەکانەوە وەردەگــرت و بــۆ مــاوەیەک لە ناوەنــدەکانی فکــری ئیــسلامییدا بــرەوی پەیــدا کــرد، لە کۆتــایی ســەدەی ســێهەمدا لە لایەن ئەشعەریەکانەوە تووشی پەرچەکردارێکی توند بوونەوە، بزووتنەوەی نوێ رێبەرێکــی زۆر بە گڕوتینــی هەبــوو بە نــاوی ابوالحــسن ئەشــعەری، لەدایکبووی ٢٦٠ کۆچیە، کە ماوەیەک لای مامۆستا موعتەزیلیەکان قوتابی بوو، شێوازەکانی ئەوان فێر بوو، پاشان بە هەمان فۆرمی خۆیان ئەو کۆشــکەی رووخانــد کە مــوعتەزیلە بە زەحمەتــی زۆر ســازیان کردبــوو. ئەشعەری لەگەڵ مامۆستاکەی ابوعلی جبائی کە نوێنەری موعتەزیلەکانی بەسرە بوو[1] زۆر جەدەلی دەکرد و بە هۆی ئەم دەمەقاڵەو باسانەوە بوو کە پەیوەنــدی هاورێیانەیــان پچــڕا و ئەشــعەری بارەگــای مــوعتەزیلەی جێهێشت.

ئیــشپی تــا دەنووســێت: ئەشــعەری لەلایەنێکــی تریــشەوە بــۆ ئــێمە کەسایەتیەکی گرنگە، بەو مانایەوە کە جێگری راستەقینەی سەردەمی خۆی بوو و لەگەڵ گەڕیانە یەک لە دوای یەکەکانی ئەوکاتەدا ئاشنایەتی هەبوو، گەڕیــانە جیاوازەکــانی ئەو ســەردەمە گــرنگە سیاســی و ئــایینیە لەودا بە ئاشکرا دیار بوو: ئیمانی موتەشەریعەکان و عەقڵی موعتەزیلە لە کەسایەتی

---

1 Mehren " Extracts from Ibon Asakir" Travaux de la Troisieme session du congres Intimantional, des Orientalistes,p.261

ئەودا یەکیـان گرتبـوو. ئەشـعەری لە منداڵیـدا موتەشـەریع و لە لاویـدا موعتەزەلی بوو، ژیانی ئەو ئاوینەی باڵانوێنی نەتوانایی منداڵانەی ئەو یەکە و ناکـامڵبوونی ئەم یەکە بـوو. لە بەرامـبەر جـاحظ دا دیـکەی زانایـانی مـوعتەزیلە زەینـی خۆیـان لەهەر جـۆرە کۆتوبەنـدێک رزگـار دەکـرد و لە هەندێ کاتـدا تووشـی بیرکردنەوەیەکی زۆر نێگەتیڤ دەبوون. ئەشـعەری لەم نێـوانەدا خوازیـاری ئەوە بـوو کە ئیـسلام لە تـوخمە بێگانەکـان پـاڵفتە بکـات، هەروەهـا شـعوری ئـایینی خەڵـک لەگەڵ میزانـی ئـایینی ئیـسلامدا هـەماهەنـگ بکـات. هزرخـوازە موعتەزیلیەکـان جیهانیـان تەنهـا بە پێـوەری عەقـڵ هەڵدەسـەنگاند و ئایینیـان لەگەڵ فەلـسەفەدا ئـاوێتە کـرد و بـاوەڕە ئایینیەکانیان لەگەڵ چەمک و پێناسـە فەلـسەفیەکاندا بەراورد دەکرد. ئەوان کەم تاکورتێـک لە پێداویـستیەکانی سرووشـتی مرۆیـی غافـڵ بـوون و یەکگرتوویی دەزگـای ئـایینی ئیـسلامیان خستە مەترسیەوە و هەر لێرەوە بوو کە پەرچەکردارێک لەبەرامبەریدا دەرکەوت.

پەرچەکرداری ئەشـعەری لەبەرامـبەر فیـرقەی مـوعتەزیلەدا بـووە هـۆی ئەوە کە شـێوازی جەدەلـی موعتەزیلەکـان بـۆ پاراسـتنی وەحـی خـوایی بەکاربهێنرێـت. ئەشـعەرییەکان بـۆ رەتکـردنەوەی بـاوەڕی هزرخوازەکـان تیۆری سیفەتەکانی خوایان هێنایە ئاراوە و لە بـابەتی ئیرادەدا رێگەیەکیـان دۆزیەوە لە نێـوان جەبـری تونـدڕەوەی پێشین و ئیختیـاری لەڕادەبەدەری موعتەزیلەدا. هەورەها ڕایانگەیاند کە ئیختیـار و گشت کردەوە مرۆییەکـان دروستکراوی خوان و توانـای بەدەسـتهێنانی کـردەوە جیاوازەکـان دراوەتە مرۆڤ.

فخرالدین رازی کە بە هۆی هێرشی قورسی بۆ سەر فەلسەفە بە توندی لە لایەن نصیرالدین طوسی و قطب الدین شیرازی بەرەنگاری کرا، ئیمکانی بەدەسـتهێنانی چـالاکیە جیاوازەکـانی ئینکـار کـرد. لە لێکدانەوەیەکـدا کە لەسـەر قورئـان نووسـیویەتی بە ئاشـکرا بەرەو جەبرخوازیـاری پەیـدا

کـردووه. یەکێکـی تـر لە فیرقەکـانی دژ بە هزرخـوازیی بە نـاوی ماتریـدیە دەناسـرێت و لەسـەر دەسـتی ئەبومەنـصور خەڵکی ماتریـدی سـەمەرقەند بنیـاتنراوە و لەم بـوارەدا لەگەڵ هزرخوازەکانـدا هـاوڕا بـووە، لەبەرامـبەر باوەڕی ئەشعەری ئەمەی فێر دەکرد کە مرۆڤ بەسەر چالاکیەکانی خۆیدا بە تەواوەتـی سـوڵتەی هەیە و هێـزی ئیختیـاری ڕێگە دەبـڕێتە نـاو گـشت کردەوەکانیەوە.

ئەشعەری ئەم بابەتانەی تەنها لەبەر بەرژەوەنـدی ئـایین بـاس کـردووە، بەڵام بـابەتی هــەمـاهەنگکردنی عەقـڵ و وەحـی بەپێـی پێویـست کێـشرایە بابەتی زاتی کۆتایی جیهان و دیکەی باسە فەلسەفیەکانەوە. لەم کاتەدا بـوو کە باقلانی دەسـتی دایە لێکدانەوەی هەنـدێک لە بـابەتە فەلـسەفییە ڕەهاکـان وەک ئەوەی کە ئایا جەوهەر یەکەیەکی تاقانەیە و بۆشایی کامڵ مـسۆگەرە و بابەتەکــانی دیــکە و بە تویژینەوەکــانی لە زانــستی کەلامــدا بــوارێکی فەلسەفی بۆ ئایینی ئەشعەری پێکهێنا. پاش ئەوە بیرمەندە ئەشعەریەکان بە مەبەسـتی ڕووبەڕووبـوونەوە لەگەڵ سیـستمە فەلـسەفیەکانی ڕۆژگــاری خۆیـان بە ناچـار ڕوویـان کـردە داڕشـتنی فەلـسەفە و تیـۆریەکی تایبەتیـان سەبارەت بە زانست داڕشت. ئێمە لەم پێگەیەدا نامانەوێ ئـاوڕ بدەینەوە لە لایەنگریی فیـرقەی ئەشـعەری لە شـەرع و بـابەتە شـەرعیەکان، بـۆ نمـوونە نــامەخلووقبوونی قورئــان و دیتنــی خــوا. تەنهــا هەوڵــدەدەین کە لە نێـوان موجادەلەکــانی موعتەزیلیەکــان تــوخمە فەلــسەفیەکانی ئەم فیــرقەیە دەربکێشین و بوارە فەلسەفیەکەی بخەینە بەرباس.

لە ئـایینی ئەشـعەرییدا، خـوا بـوونی واجبـی کۆتـاییە و سـیفەتەکانی خـوا ڕێک هەمان زاتی ئەون و بوون و چییەتی ئەو تاقانەیە.(۱) ئەشعەریەکان بۆ

---

1 Martin Schereiner " Zur Geschichte,des Asaritenthums,Huitieme Congres International des Orientalistes, II Patie,1839,p.113

سـەلماندنی هەبـوونی خـوا بەدەر لەوەی کە کەڵکیـان لە بـابەتی پێکهـاتنی حەرەکە وەرگرت، ئاوها لێکدانەوەیان کرد:

١. هەموو شتەکان بە هـۆی بوونی خۆیـانەوە یەکێکن، بەڵام سـەرەڕای ئەم یەکبوونە چییەتی جیاواز و تەنانەت دژ بە یەکیشیان هەیە، کەواتە بۆ روونکردنەوەی جیاوازی نێوان شتەکان هۆیەکی کۆتایی هەیە.

٢. بـۆ هەبـوونی هەر بـوونەوەرێکی خوڵقاو، هـۆیەک پێویستە و کەواتە دەبێ هۆکارێک هەبێت و ئەو هۆکارە - خوایە.

ئەشـعەریەکان سـەبارەت بە خوڵقانـدنی جیهـان دەیـانوت: هەرچـی لە جیهانـدا هەیە یـان جەوهەرە یـان دەرکەوتەیە. دیـارە کە دەرکەوتە خـۆی سـازکراوە و لەبەرئەوەی کە هـیچ جەوهەرێک ناتوانێت سـەربەخۆ بێت لە دەرکەوتە، کەواتە پێویست دەکات کە جەوهەریش دروستکرا بێت.

سـازدرانی جەوهەر خوڵقانـدنی دەرکەوتە بە پێویـست دەکـات و ئەگەر باوەڕمان بە پێشینەی جەوهەر بێت دەبێ بـاوەر بە پێشینەی دەرکەوتەش بکەین. ئەشـعەریەکان لە وەڵامـی ئەم پرسـیارەدا کە "شـت چیە؟" بە وردی رەخنەیان لە مەقولاتی ئەرەستۆ گرت و گەیشتنە ئەم ئاکامە کە شـتەکان لە کــاتی خۆیانــدا هــیچ جــۆرە تایبەتمەنــدییەکیان نیــیە. ئەوان لە نێــوان تایبەتمەندییە سەرەتایی و دواییەکانی شتەکاندا هیچ جیاوازیەکیان دانەنا و هەمــوو تایبەتمەنــدییەکانیان بە بەراوردی زەینــی زانــی. کوالیتەیــان بە دەرکەوتێک زانی کە بێ ئەوە بوونی جەوهەر ئەستەمە.

وشــــەی "جەوهەر" یــــان "پــــاژەی دابەشــــنەکراو" لە روانــــگەی ئەشـعەرییەکانەوە بە ئاشـکرا باسـی لە بـابەتی دەرەکـی نەدەکـرد، ئەوان بەپێـی غیرەتـی ئـایینی خۆیـان و بـۆ پاراسـتنی چەمکـی خوڵقانـدنی ئیلاهـی، جیهانیــان بە پیــشانگای بــابەتە زەینییەکــان زانــی و وەک بێــرک لــی Berkeley دیسیپلین و رێکی بابەتە زەینیەکانیان بە مەشیەتی خوا پێناسە کرد.

کانت لە هەڵسەنگاندنی گەریانی ناسینی مرۆڤدا تەنها تا چەمکی شی فی النفسە واتە Ding an Sich چووە پێشەوە. حەکیمە ئەشعەرییەکان لەم سنوورە تێپەڕ بوون و بە پێچەوانەی حەقیقەتخوازەکانی ئەو سەردەمە ئەمەیان ڕاگەیاند: شی فی النفسە، یان زاتی ناوخۆی شتەکان تەنها لەبەر ئەوەی کە دەکەونە بەر ئیدراکی تاکی کەسی بینەر، بۆیە پەیدا دەبن. کەواتە مەزهەبی زەڕە یان پاژەی ئەوان لە تیۆری ئەتۆمخوازیی لۆتزە Lotze دەچێت.

لۆتزە هەرچەند خوازیاری سەلماندنی ڕاستەقینەی دەرەکی بوو، بەڵام گەیشتە ئەو شوێنەی کە ڕاستەقینەی دەرکی کرد بە زەینیەتی ڕەها.[1] بە گشت ئەم باسانەوە ئەشعەریەکان و لۆتزە نەیانتوانی پاژەکان بە خوڵقێنراوی بوونی کۆتایی بزانن. ئەوان وەها لە تەوحیدی ڕەهادا نغرۆ نەبووبوون کە هەرچی هەیە بێجگە لە خوا، وەلا بنێن. لە ئاکامدا هەرچەند بە شێوەی بارکلی لە ڕوانگەی گریمانەخوازی رەهاوە دەستیان دایە لێکدانەوەی ماددە، رەنگە دیسان بە جەبری هەندێک واقعخوازیی غەریزی و بە حوکمی سونەتی مەزهەبی زەڕە بوو کە دەستیان لە وشەی "زەڕە" هەڵنەگرت. بەم ئامێرەوە هەوڵیاندا مۆرکی واقیعخوازیی بنێن لە گریمانەخوازیی خۆیان. ئەشعەریەکان لە بەرامبەر بەرژەوەندییەکانی زانستی جەزمی کەلام، بە ڕوانگەیەکی رەخنەییەوە ئاوڕیان لە فەلسەفەی ڕەها دایەوە و لە ئاکامدا داڕشتنی فەلسەفە ئەوانی ڕاکێشا بۆ خۆی و دەستیان دایە دامەزراندنی سیستمێک.

---

[1] لوتسە لە ئەتۆمخوازەکانە، بەڵام ئەتۆم بە ماددە نازانێت، دەڵێ: چییەتیە هەستکراوەکان و قەبارە بەرهەمی کردەوەی بەرامبەری ئەتۆمەکانن. کەواتە ئەتۆم خۆی دەتوانێت خاوەنی تایبەتمەندی بەردەوامی بێت، حەقیقەتی هەستکردنی قەبارە وەک حەقیقەتی ژیان و دیکەی هەستەکان لە هارکاری نیوان نوقتەکانی هێز پێکدێت.

یەکێکی تر لە بابەتە فکرییەکانی ئەشعەرییەکان لە باری فەلسەفییەوە پڕ مانا و زۆر گرنگە، بابەتی هۆیە، حەکیمە ئەشعەرییەکان بۆ سەلماندنی ئیمکانی موعجیزە بنەمای هۆ یان نەفی کرد هەربەو شێوەیە کە هێرشیان کردە سەر باوەڕی موعتەزیلە سەبارەت بە نەبینراوبوونی خوا، بە رەتکردنەوەی بنەماکانی زانستی ابصار، بانگەشەی ئەوەیان کرد کە خوا هەرچەند حەجمی نییە، بەڵام دیسان دەکرێ ببیندرێت. لەوکاتەدا خاوەن شەرعە ئیسلامیەکان باوەڕیان بە موعجیزە هەبوو، هەروەها بنەمای هۆی گشتیان پەسند کردبوو و دەیانوت کە خوا لەکاتی موعجیزەدا بنەمای هۆ، رادەگرێت و دەیوەستێنێت.

ئەشعەرییەکان بەڵام بە داڕشتنی هاوسانی هۆ و هۆکار، سەرپێچییان لە بیروڕای خاوەن شەرعەکان کرد و رایانگەیاند کە چەمکی هێز یان هۆ پووچە، هەرچی کە سەبارەت بە شتەکان دەیزانین هیچ نییە بێجگە لە کاریگەریەتی شەپۆلگەلێک کە بە ئەمری خوا یەکیانگرتووە و دەگەنە ئێمە.

## ٤. غەزالی

لێکـدانەوەی فەلـسەفەی ئەشـعەری بـێ باسـکردن لە ابوحامـد محمـد غەزالی، کە ساڵی ٥٠٥ کۆچی دوایی کردووە، ناتەواوە. هەرچەند زۆرێک لە زانایانی کەلام سەبارەت بە غەزالی بەشێوەیەکی هەڵە حوکمیان داوە، بەڵام گومـان لەوەدا نیـیە کە ئەم فەیلـسووفە یەکـێکە لە گەورەتـرین کەسایەتیەکانی جیهانی ئیسلام. غەزالی "شکاک"یەکێکی بەتوانا بوو کە بەر لە دیکارت بە شێوازی فەلسەفی ئەو بیری کردەوە[1].

هەروەها حەوتسەد ساڵ پێش هیوم بە لێواری تیژی شێوەی جەدەلی خۆی، کۆتوبەندی هۆیەتی پچراند.

غەزالـی یەکەمـین کەس بـوو کە کتێبێکـی رێکـی نووسـی سـەبارەت بە رەتکردنەوەی فەلسەفە و شەریعەتیەکانی رزگار کرد لە ترسێک کە بەرامبەر خـاوەن فەلـسەفەکان هەیـانبوو. توانـایی ئەو بـووە هـۆی ئەوەی کە لەوەبەدوا موتـالای بـابەتە ئایینەکـان لەگەڵ موتـالای فەلـسەفەدا تەریـب ببێـت و بـوار بڕەخسێت بۆ سیستمێکی پەروەردەیی وەهـا بەرز کە گەورە پیاوانێکی وەک ابـوالفتح تـاج الـدین شەهرستـانی و محمـد زکریـا ڕازی و شـهاب الـدین یحیـی سەهرەوەردی لەوێدا گەشە بکەن.

غەزالـی سـەبارەت بە روانینـی خـۆی ئاوهـای نووسـیوە: لە سـەردەمی منداڵییەوە خوازیاری ئەوە بووم کە شتەکان بە بیری خۆم بناسـم و بەپێی ئەم ناسـینە بـوو کە سـەرپێچیم لە ژێـدەرەکانی مامۆسـتا کـرد. گـشت ئەو بیروبـاوەڕانەی کە لە منـداڵییەوە لە زەینـی منـدا چەقیبـوون گرنگـایەتی پێـشووی خۆیـان لەدەسـت دا. تێگەیـشتم کە لە مێـژە جوولەکەکـان و

[1] کتـاب احیـاء العلـوم الـدین غزالـی، لێکچـوونێکی وەهـای هەیە لەگەڵ گوتـار سـەبارەت بە رەوشتی دیکارت، کە ئەگەر لە سەردەمی دیکارتدا وەرگێرانێکی لەبەر دەستدا بوایە هەموان دیکارتیان تاوانبار دەکرد کە انتحالی کردووە.

مەسـیحیەکان و پەیڕەوەکـانی ئایینەکـانی تـر ئەسـیری سـەرچاوە دۆکیۆمێنتیەکان بوون، لە حاڵێکدا کە زانستی راستەقینە دەبیَ لەهەرجۆرە گومانێـک بەدوور بێـت. بـۆ وێـنە دیـارە کە دە لە سـیَ زیـاترە و ئەگەر کەسێک هەبێت کە بتوانێت دارێک بکاتە مار و نمایشتێکی سەیر بخولقێنێت، هەوڵبدات کە پێچەوانەی سیَ و دە بسەلمێنێت دیارە بەوپەڕی تواناکەیەوە لەم بابەتەدا بیَ توانا دەبێت. ئەوە بابەتێکی حاشاهەڵنەگرە.

غەزالی گشت سـەرچاوەکانی ناسینی خستە بەر لێکۆڵینەوە و لە ئاکامـدا تەسـەوفی بە سـەرچاوەی راستەقینەی ناسـین زانـی، هەروەهـا بە جـدییەتەوە دەسـتی دایە بـابەتی چییەتـی نەفـس لە حاڵێکـدا کە ئەشـعەرییەکان بە هـۆی تەوحیدی وشک و بەپێی ڕوانینی بەرتەسکی خۆیـان لە جەوهەر، نەیاندەتوانی بە سـانایی لەم بـارەوە بـدوێن. غەزالـی سـەبارەت بە خـواش باسـێکی هێنـایە ئـاراوە، گێـڕانەوەی وردی ئەم باسـە زۆر دژوارە وەک بـۆرگێرBorger و زۆلگێر Solger ئەڵمـانی هەمە خوایی سۆفیانەی لەگەڵ چەمکی تـاقە خـوایی دیاری ئەشعەریەکان ئاشت کردەوە، هەربۆیە بەئاسانی ناکریَ بڕیار بدەین کە ئایا غەزالی پەیڕەوی فەلسـەفەی هەموو خـواییە بە تەواوەتـی یـان بە شـێوازی تاکی ئیمانی بە هەمە خوایی هەیە وەک باوەڕەکانی لۆتزە.

لە روانینــی غەزالییــدا نەفــس توانــای درککردنــی شــتەکانی هەیە، بەڵام درککـردن بـابەتێکی دەرکەوتەیە و دەبیَ پەیوەسـت بێت بە جەوهەرەوە، یـان زاتێکی ئازاد لە گشت دەرکەوتەکانی جەسـتە. غەزالـی لە وتـاری (المـضنون بە علـی غیـر اهـلە)، خۆپاراسـتنی پێغەمـبەری لە کەشـفکردنی چییەتـی نەفس یـان رۆح باسکرد و نووسی: خەڵک دوو گرووپن، ئەوانەی بیرێکی سـاکاریان هەیە و بیرمەندەکان. سادەبیرەکان ماددە بە مەرجی بوون دەزانـن و وێنەیەکیـان لە جەوهەری تـاک نییە. بیرمەنـدان بە لـۆژیکی خۆیـان دەسـتیان دەگـاتە چەمکی بەربڵاوی نەفس کە گشتگری خوا و رۆحی تاکیە. ئەم بـابەتە ئەوە دەگەیەنێت کە غەزالی خوازیاریی بەرەو هەمە خوایی هەبووە و هەربۆیە بەلایەوە باشـتر بووە کە سەبارەت بە چییەتی کۆتایی نەفس بێدەنگ بمێنێتەوە.

غەزالی بە یەکێک لە ئەشعەریەکان دەزانن، بەڵام بەڕاستی وانییە و غەزالی مەزهەبی ئەشعەری تەنها بۆ خەڵکی ئاسایی بە باش دەزانی. بەپێی نووسراوێکی شبلی: غەزالی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە نهێنی ئیمان ناکرێ کەشف بکرێت، هەربۆیە خوازیاری پەرەپێدان بە ئیلاهیاتی ئەشعەری بوو. بە هەوڵێکی زۆرەوە قوتابیە تایبەتەکانی خۆی ئاگادار دەکردەوە کە بەهیچ شێوەیەک بەرهەمی بیرکردنەوەکانی ئەو بڵاو نەکەنەوە.

ئەم باوەڕە و هەروەها هەوڵی ئەو بۆ بەکارهێنانی چەمکە فەلسەفیەکان شەریعەتیەکانی بەدگومان کرد. ابن جوزی و قاضی عیاض و هەندێکی تر لە حەکیمە شەرعیە ناودارەکان بە ئاشکرا ئەویان بە "لادەر" زانی و تەنانەت عیاض لەوەش زیاتر رۆی و ئەمری کرد کە هەموو بابەتە فەلسەفی و ئایینیەکانی غەزالیان لە سەرانسەری خاکی ئیسپانیا لەناوبرد.

بە باسکردنی ئەو بابەتانە ئەوە دەردەکەوێت کە شێوازی جەدەلی موعتەزیلە نکوڵی لە شکۆی خوا کرد و ئیلاهیاتی وەک گشتیەتێکی نادیار پێناسە کرد، بەڵام بزووتنەوەی ئەشعەری لایەنی تاکی خوای خستە بەرباس و لە جیاتی ئەوە واقیعی دەرەکی سرووشتی ئینکار کرد. هەرچەند سیستمی موعتەزیلە لە بواری باکردن لە دەرکەوتەی پاژەی دابەشنەکراو لەرزۆک بوو، بەڵام بە گشتی ئەم فیرقەیە ئەم وردەی بە راستەقینەیەکی بینراو دەزانی. ئەشعەریەکان ئەوەیان بە ساتێکی تیژ تێپەڕ لە ئیرادەی خوا دەزانی. موعتەزیلە سرووشتیان قبووڵ دەکرد، بەڵام خوای خەڵکی ئاساییان رەتدەکردەوە. ئەشعەرییەکان سرووشتیان دەکردە قوربانی تاک و خوای شەریعەتیەکان رزگار بکەن.

لە بەرامبەر ئەم دوو فیرقەیەدا سۆفیەکان دەبینین کە سەرخۆشی خوان و بەدوور لە گشت هەراوهوریا ئایینیەکانی ئەو رۆژگارە هەردوو لایەنی جیهانیان قبووڵ کردووە، بە شێوازیکی رۆحانی بریسکەداریان کردووە و گشت جیهان بە دەرکەوتەی خوایی دەزانن. ئەو چەمکە دژوارانەی کە

مەزهەبەکانی تر بە خوایان دەبەستەوە لە خوای تەعالای سۆفیەکاندا کۆ بوونەوە. دوایین دەنگی موعتەزیلە هزرخوازەکان یان بە وتەی سۆفیەکان "ئیستیدلالیە پیّ دارین"ەکان لە زمانی غەزالی شەکاکەوە دەبیستین. رۆحی نائارامی ئەم حەکیمە پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر لە بیابانی پڕ لە مەلالی هزر و ئیستدلالدا سەرگەردان بوو، لە کۆتاییدا لە قولاّیی هێمنی هەستە مرۆییەکاندا بۆ خۆی جێگەیەکی ئارامی پەیدا کرد. غەزالی بە مەبەستی پاراستنی ئیلاهیاتی ئیسلامی گومانی لە باوەڕە باوەکانی ئەو سەردەمە نەکرد، بەڵکو شک و گومانی ئەو سەرەتای هەوڵێک بوو کە بۆ گەیشتن بە زانیاریەکی سەرترەوە روویدا. کەواتە دەبیّ گومانکردنی غەزالی وەک سەرکەوتنی ئارامی تەسەوف بەسەر دیکەی خوازیارییە عەقڵانیەکانی ئەو سەردەمە بزانین، خزمەتکردنە پۆزەتیڤەکانی غەزالی بە فەلسەفەی ئێران دەبیّ لە کتێبێکی بچووکدا بە ناوی مشکوه الانوار بدۆزینەوە. غەزالی کتێبەکەی خۆی بە ئایەتێک لە قورئانەوە دەست پێکردووە: خوا نووری ئاسمانەکان و زەویە. پاشان گەڕاوەتە دووالیزم دێرینی ئێرانی - روونـاکی و تاریکـایی- کە پـاش ئەو لە لایەن شـێخی ئیشراقەوە پەرەیسەند و رایگەیاند کە روونـاکی تەنها بوونی راستەقینەیە و هیچ تاریکاییەک گەورەتر نییە لە تاریکایی نەبوون. زاتی روونـاکی هەبوون یان تەجەلی کردنە و تەجەلی هەمان پەیوەستەییە[1].

جیهان لە تاریکاییەوە پێکهات بەڵام خودا لە نووری خۆی بەسەردا پژاند و هەر بەشێک بەپێی روونـاکیەک کە وەریگرت لە دەرەجەیەکدا شیاوی دیتن بوو. شتەکان پێکەوە جیاوازن، هەندێکیان تاریکن هەندێکیان تـارن، هەنـدێک روونـاکن و هەنـدێکیش روونـاکی دەبەخـشن. هەر بەم شێوەیە خەڵکیش پێکەوە جیاوازن، هەندێک لە بوونەوەرە مرۆیەکان دیکەی خەڵک رووناک دەکەنەوە، هەربۆیە پێغەمبەری ئیسلام لە قورئاندا "سراج منیر" زانراوە. چاوی جەستە تەنها دەرکەوتە دەرەکیەکانی نووری رەها

[1] ابوحامد محمد غزالی، مشکوه الانوار، کتێبخانەی ئیدارەی هیندستان بەرگی ٣.

یان راستەقینە دەبینن، بەڵام لە ناو دڵی مرۆڤدا چاوێکی دەروونی هەیە کە پــێچەوانەی چــاوی دەرەکــی خــۆی وەک غەیــر دەبینێــت و لە بــابەتە موتەناهیەکان تێپەڕ دەبێت و درز دەکاتە حیجابی تەجەلییەوە.

بەڕاستی ئەندێشەی غەزالی لە مشکوە الانواردا تۆیەک بوو کە بەرەبەرە ڕووا و لە کاتی خۆیدا میوەی کرد. بەرهەمەکەی فەلسەفەی ئیشراقی شهاب الدین سهروردی بوو. ئایینی ئەشعەری لە پانتایی دینیدا گۆڕانکاریی زۆری سازکرد. یەکێک لەم گۆڕانکارییانە سەرکوتکردنی ئازادبیرییەکی نزیک لە ئیرتیداد بوو کە هەڕەشەی لە دەزگای ئایینی ئیسلامی دەکرد. لە دەڤەری فەلسەفەشدا خوڵقینەری گۆڕانکاریی مەزن بوو. وەک نموونە:

١. بە هۆی دزەی ئایینی ئەشعەری فەلسەفەی یۆنانی بە ئازادی کەوتە بەر ڕەخنە.

٢. لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیدا کە ئایینی ئەشعەری قەڵای هزرخــوازیی سەربەســەر رووخانــد، شــێوازێک کە دەبــێ نــاوی بنێــین پۆزەتیڤیــسمی ئێرانــی بەشــێک لە بیرمەنــدانی بەرەولای خــۆی راکێــشا. ابوریحان محمد بێرونی[1] و ابوعلی بن هیثم لەم گرووپە بوون.

ابن هیثم کە توانی "کاتی پەرچەکردار"[2] بۆ یەکەمینجار باس بکات، بە یەکێک لە پێشاهەنگەکانی دەروونناسی ئەزموونی نوێ دەناسرێت. ابن هیثم لیکۆڵینەوە سەبارەت بە بابەتە ئەوپەڕ هەستیەکان یان (فوق حسی) بە ڕەوا نەزانی و سەبارەت بە بابەتە ئایینیەکان بێدەنگیەکی بەپارێزی هەڵبژارد.

بەر لە رۆژگاری ئەشعەری ئەم جۆرە شێوازانە یان نەدەکرا پاساوی بۆ بێتەوە، یان هەر لە بنەڕەتەوە بەرهەم نەدەهاتن.

---

[1] بیرونی وانەکانی آریابهاتای لا پەسند بوو و ئاوەها باس دەکات: ناسینی ئەو بابەتەی کە لە ژێر تیشکی خۆردا رووناک بۆتەوە بۆمان بەسە. ئەوەی لە پشت ئەم بابەتەوەیە هەرچەند پانتایەکی بەربڵاوی هەیە، بەڵام قازانجی نییە بۆمان. هەستەکان ئەو شتەی لە خۆر بەدوور بێت درک پێناکات و شتێکی کە هەستەکان درکی پینەکەن بۆمان بەردەست نییە.

[2] بریتییە لە مەودای نێوان دەستپێکی چالاکی بە هۆی بزواندنی دەرەکی و دەستپێکی پەرچەکرداری ئۆرگانیزم .

ئەشـعەریەکان بە ئینکـارکردنی دێـوەزمە گەورەکەی ئەرەسـتۆ و هەروەهـا داڕشتنی باوەڕە تایبەتەکانی خۆیان سەبارەت بە چییەتی شـوێن و کـات و هۆیەتی، ئاگری ڕۆحی لەغاو نەگروتووی جەدەلە فکریەکانیان هەڵگیرسـاند. ئەم جەدەلانە بیرمەندانی ئیسلامی چەندین سـەدەی کردە دوو بەشـەوە و لەئاکامـدا بـووە وردە وانە و وشـــەکانی قوتابخانەکـان و لەو گـڕ و تیـنە کەوت. لەم نێوانەدا نجم الدین علی دبیران کاتبی، خاوەنی پێگەیەکی بەرزە. کاتبی یەکێک بوو لە پەیڕەوەکانی ئەرەستۆ، قوتـابی وەهـای پەروەردە کرد کە بەرامبەر بە ئەهلی ئایین ڕاوەستان و بە "حەکیم" ناویان برا.

کاتبی بە نووسینی کتێبی حکمه العین، شەڕو دەمەقاڵەی فکریی جیهـانی ئیسلامی زیـاتر کـرد و لەوە بەدوا بیرمەنـدە گریمانەخوازەکـان بەتـایبەت ئەشـــعەریەکان لەگەڵ واقیعخوازەکانـــدا بەشـــەڕهاتن و دەســـتیان کـــردە ڕەخنەی توند لە یەکتر. لەم بەشـەدا خاڵەکـانی جیاکاریی و هـۆی دژکـاریی ئەم دوو لایەنە دەخەینە بەر باس.

## ١. چییەتی

بیرمەنـدە ئەشـعەریەکان بەپێی ڕەوتـی تیـۆری ناسـینی خۆیـان لەسـەر ئەو بـاوەڕە بـوون کە چییەتـی شـتەکان بە تەواوەتـی لە یەکتـر جیـان و هەرکامیان لەلایەن هۆی کۆتایی ئان خودا داڕێژراون.

ئەشـعەریەکان ئەوەیـان قبـووڵ نەکـرد کە هەوێنێکـی سـەرەتایی بـوونی هەیە کە بەردەوام دەگۆڕدرێت و هەموو شـتەکان لەو هەوێنەدا هاوبەشـن، پێچەوانەی هزرخوازەکـان لەسـەر ئەو بـاوەڕە بـوون کە هەبـوون لە زاتـی چییەتیـدایە و کەواتە چییەتـی و بـوون هاوبەشـن، ئەوەیـان باسـکرد کە ڕستەی "مرۆڤ ئاژەڵە" تەنها لەکاتێکدا جێی قبووڵکردنە کە لە نێوان بـابەت و هەڵگرەکەیدا جیاوازیەکی بنەڕەتی هەبێت. ئەگەر بـابەت و هەڵگـرەکەی بە تەواوەتـی یەکێـک بـن هـیچ ئاکامێـک لە حـوکم وەرناگیردرێـت. ئەگەر بە

تەواوەتــی جیــاوازبن، هەڵگــرتنەکە بێهــودەیە. لەم حــاڵەتەدا دیــارە کە بــۆ جیاکردنەوەو دەرخستنی لایەنە جیاوازەکانی بوون پێویستمان بە هۆیەکی دەرەکی هاوبەشە. دژکارانی ئایینی ئەشعەری ئەوەیان سەلماند کە بوون تووشی گۆڕانکاریی و سنووردارییەتی دەبێت، بەڵام بانگەشەی ئەوەشیان دەکرد کە هەمــوو روخسارە جیاوازەکانی بــوون یەکێکن، لەبەرئەوەی کە هەموویــان لە داڕشــتنی یەک بنــاغە واتە جەوهەری ســەرەتاییدا بەشــدار بوون.

حەکیمە مەشائی یان ئەرەستۆییەکان بۆ ساغکردنەوەی ئیشکالیەتی هەڵگری گشت چەشن بابەتی چییەتیە گشت چەشنەکانیان هێنایە ئاراوە و ئەوەیان شی کردەوە کە حوکمی "مرۆڤ ئاژەڵە" راستە، لەبەرئەوەی کە مــرۆڤ بــوونێکە پیکهــاتوو لە دوو چییەتــی ئــاژەڵایەتی و مرۆڤــایەتی. ئەشعەرییەکان دژ بەم بیروڕایە هەستان و رایانگەیاند کە: ئەگەر وا بڵێن کە چییەتــی مــرۆڤ و ئــاژەڵ یەکــێکە وەک ئەوەی کە چییەتــی گــشت لەگەڵ چییەتی پاژە بە یەکێک بزانن، ئەمە باتڵە، چونکە ئەگەر چییەتی شتی گشت چەشن رێک هەمان چییەتی شتی تاک بێت دەبێ بۆ شتی گشت چەشنی تاقانە باوەڕمان بە دوو چییەتی یان دوو بوون هەبێت.

دیارە ئەم گشت جەدەلانە دەگەڕێتەوە بۆ یەک بابەت و ئەویش ئەمەیە کە: ئایا بوون ئاماژەکردنی رەهایە یان راستەقینەیە؟ بە وتەیەکی تر کاتێک باس لە بوونی شتێک دەکەین ئایا بە شێوازی گریمانەخوازەکان بوونی ئەو شتە پەیوەست بە بوونی خود دەزانین یان وەک واقیعخوازەکان بەو شتە زاتێکی سەربەخۆ لە خۆی دەچەسپێنین؟

لەم مەجالەدا بە کورتی هەندێک لە هۆهێنانەوەکانی ئەم دوو بەرە باس دەکەین:

**ئەلف**: واقیعخوازێک دەیوت: ئەو ئیدراکەی من لە خوا هەمە ئیدراکێکە راستەوخۆ یان بێ واسیتەیە، لەم تێگەیشتنە کە "من هەم" جەستەی منیش

بەشـــدارە، کەواتە جەســـتەی مـــن وەک بـــابەتێکی راســـتەقینە بە شـــێوەی راستەوخۆ دەناسرێت، وەها ناسینێک گەر بێ واسیتە نەبێت دەبێ لە چەند قۆناغدا دەستکەوتبێت کە دەزانین وەها نییە.

لەبەرامبەر بیروڕای واقیعخوازەکاندا فخرالدین ڕازی کە یەکێک بوو لە بیرمەندە ئەشعەریەکان رایگەیاند کە ئیدراکی بوون بێ واسیتە روو دەدات، بەڵام ئەم حـوکمە کە "ئیـدراکی بـوون بـێ واسـیتەیە" وەردەگیردرێـت و راستەوخۆ نییە.

شـــمس الـــدین محمـــد مبـــارک، ئەوەی وەبیرهێنـــایەوە کە گـــشت هۆهێنانەوەکانی واقیعخوازەکان لەسەر ئەم تیۆرە راوەستاوە کە "ئیدراکی بوونی من بێ واسیتەیە"، ئەگەر ئەوە قبووڵ بکەین کە ئیدراکی بوونی من بێ واسیتەیە ئەم لێکدانەوەی لێناکرێت کە ئیدراکی بوونی رەهاش دەبێ وەها بێت، ئەگەر واقیعخوازەکان بێ واسیتە ئیدراکی شتێکی ورد دەکەن ئێمە رەخنەیان لێ ناگرین، بەڵام پێچەوانەی ئەو شتەی چاوەڕوانیان دەکرد لەم پێشەکیەوە ناتوانین بەوە بگەین کە بوونی رەوان لە هەموو شتەکاندا بە هەمـان شـێوە و بـێ واسـیتە درک بکرێـت، هەروەهـا بەدەر لەو باسـە ئیـدەی واقیعخوازەکـان ئەوەی لێـدەکەوێتەوە کە لە خـۆگریی چییەتـی شتەکان ئەستەم بێت و بۆ نموونە ئیدراکی حوکمی "بەفر سپییە" نەگاتە واقیع، لەبەرئەوەی ئەگەر ئیدراکی ئێمە لە بەفر بێ واسیتە بێت پێویست دەکات کە درک بە سپیبوونی بەفریش بکەین کە بەشێکە لە خودی بەفر بەشێوەیەکی بێ واسیتە و بێ هەڵگر.

ئەم ئیستدلالە دواییە لە لایەن حەکیمی واقیعخوازەوە مەلا محمد هاشم حـسینی رەت کـراوەتەوە، بە بـاوەڕی حـسینی زەیـن لە کـاتی هەڵگرتنـی سـپیەتی بـۆ بەفـر، دەڕوانێـتە بـابەتێکی بە تەواوەتـی زەینـی واتە چییەتـی سپیەتی و ئیشی نییە بەسـەر زاتـی بیندراو و راستەقینەی بەفر کە دەبێتە تایبەتمەندییە جیاوازەکانی.

حسینی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئێمە دەتوانین زاتی بە وتەیەک نەناسراوی شتەکانیش بێ واسیتە درک بکەین، چونکە ئێمە ئیدراک بە هەر شتێک وەک یەکەیەکی سەربەخۆ دەکەین و هیچ کات لەلایەنە جیاوازەکانی بابەتی ناسینی خۆمان جیا لەیەکتر تێناگەین. ئەم ئیدەیە کە پاشان لە لایەن هەمیل تۆن Hamilton داڕێژرا، حسینی لە دیکەی واقیعخوازەکانی ئەو رۆژگارە دوورخستەوە.

ب: لە روانگەی واقیعخوازەکانەوە هەر حەکیمێکی گریمانەخواز کوالیتەکان دەچەسپێنێت بە پەیوەندییە زەینییەکانەوە و نکوڵی لە بوونی درێژەداری رەوان لە ناو چییەتیەکان دەکات، هەر شتێک بە کۆیەک لە کوالیەتە جیاوازەکان دەبینێت، ئەو چۆنایەتیانەی کە تەنها نمودگەلێکی زەیینین. هەرچەند باوەڕی بە جیاوازی شتەکان هەیە هەموویان بە مەدلوولی وشەی "بوون" دەزانێت و بەم شێوەیە دەیهەوێت ئیشارەت بەوە بدات کە هەموو لایەنە جیاوازەکانی بوون لە زاتێکدا هاوبەشایەتیان هەیە.

ابوالحسن الاشعری لە وەڵامی واقیعخوازەکاندا رایگەیاند کە بەکارهێنانی وشەی "بوون" بۆ هەموو شتەکان تەنها کردنی بە ئامێرێکە کە وتوویژ ئاسانتر بکاتەوە، بەڵام بە واتای نزیکایەتی زاتی شتەکان نییە. واقیعخوازەکان لە بەکارهێنانی گشتی وشەی "بوون" ئەنجامێکی تریان وەرگرت و دەنگیان هەڵبڕی کە بوونی یەک شت یان چییەتی ئەو شتەیە یان لەسەر چییەتییەکەی دەردەکەوێت. لایەنی یەکەم پێویستی بەوە هەیە کە هاوشێوەیی شتەکان قبووڵ بکەین، لەبەر ئەوەی کە ناکرێت بوون یەک شت لە بنەڕەتەوە جیاوازی هەبێت لە شتەکەی تر. بەڵام لایەنی دووهەم واتە قبووڵکردنی دەرکەوتەی بوونی یەک شت بەسەر چییەتیەکەیدا یەکسەرە باتڵە، لەبەرئەوەی دەبێ لەم کاتەدا چییەتی لە بوون دامالێن. بەم شێوەیە بوونی چییەتی نکوڵی لێدەکرێت و لە روانگەی ئەشعەریەکاندا

ئەگەر چییەتـی حاشـای لێبکرێـت ئیتـر هـیچ جیـاوازیەک نامێنێت لە نێـوان بوون و نەبووندا.

هەروەهـــا ئەگەر ئەوە پەســـەند بکەیـــن کە بـــوون لەســـەر چییەتـــی دەرکەوتــووە، دەبــێ وەڵامــی ئەم پرسـیارە بـدەینەوە کە چییەتــی بەر لە وەرگرتنی وجود چی بـووە؟ نـاکرێ بوترێت کە چییەتی بەر لە وەرگرتنی بوون، خوازیاری قبووڵکردنەکەی بووە، چونکە ئەم حوکمە پێویستی بەوە هەیە کە چییەتـی بەر لە وەرگرتنـی بـوون بـابەتێکی عەدەم بێت، هەروەهـا ئەم حـــوکمە کە "چییەتـــی خوازیـــاری وەرگرتنـــی بـــوونە" پێویـــستی بە بـاتڵکردنەوەی ئەم حـوکمەیە کە بڵێـین "چییەتـی ئێـستا ئامـادەیە"، پاشـان دەردەکەوێـت کە بـوون بەشـێک بێـت لە چییەتـی و ئەگەر وابێـت دەبـێ چییەتی بە شتێکی گشت چەشن بزانین، هەروەها بوون ئەگەر لە بەرامبەر بە چییەتـی بـابەتێکی دەرەکـی بێـت لەبەرئەوەی لەســەر شـتێکی دەرەکـی راوەسـتاو دەبێت پێکهـاتەیەکە، هەر بـابەتێکی پێکهـاتوو پێویستی بە هـۆی پێکهـاتن هەیە و کەواتە دەبـێ بـۆ بـوون هـۆیەک بـدۆزرێتەوە، ئەگەر هـۆی بوون خودی چییەتی بێت پێویست دەکات کە چییەتی بەر لەوەی پەیدا بێت بوونی هەبێت لەبەرئەوەی کە هـۆ دەبێ پێشڕەو بێت بەرامبەر بە هۆکـار، بەڵام ئەگەر هۆی بوون شتێک بێت بێجگە لە چییەتی دەبێ قبـووڵ بکەیـن کە بـوونی خـوداش دەبـێ بە هـۆیەک بـێجگە لە چییەتـی روون بکەیـنەوە و لەم حاڵەتەدا بابەتی واجب دەبێتە بابەتێک کە ئیمکانی هەیە.

لەم هۆهێنانەوەیـانەی واقیعخوازەکـانەوە ســەبارەت بە ئینکـارخوازیی وەها دەردەکەوێت کە ئەمـان نەیـانتوانی بە باشـی گریمـانەخوازیی دارێژن، بە پێچەوانەی بانگەشەی واقیعخوازەکان، پەیڕەوەکانی گریمانەخوازیی هیچ کات بوونی شتێکیان بەوە نەزانی کە چییەتی بەسـەریدا پەیدا ببێت، بەڵکو بەردەوامبـوون و چییەتیـان رێـک وەک یەک زانیـوە. هەروەک ابـن مبـارک

باسی کردووە چییەتی هۆی بوونە بێ ئەوەی کات بەسەر بووندا زاڵ بووبێت. چییەتی بوونی لە هێچ وەرنەگرتووە بێجگە لە خۆی نەبێت.

بەراستی دەبێ بڵێین کە لە بابەتی ناسیندا نە واقیعخوازە ئیسلامیەکان و نە گریمانەخوازە ئیسلامییەکان هیچ کامیان تیۆریەکی دروستیان باس نەکرد.

واقیعخوازی لائیدراکی باسی لەوە دەکرد کە لەوپەڕی چییەتی دەرکەوتەدا زاتێک بوونی هەیە کە هۆی ئەم چییەتییەیە، ئەم وتە پارادۆکسیکی تێدایە، لەبەرئەوەی باس لەوە دەکات کە لە ناو هەموو شتەکاندا زاتێک بوونی هەیە کە خۆی نەناسراوە، بەڵام ئێمە بوونەکەیمان ناسیوە، هەر بەم شێوەیە گریمانەخوازی ئەشعەری سەبارەت بە چۆنیەتی ناسین تووشی هەڵە بووبوو، قۆناغەکانی ناسینی لەبەرچاو نەدەگرت و ئیدراکاتی خۆی بە هەندێ ئاماژە دەزانی کە بە ئیزنی خودا دێتە ناو زەینی ئەو، رەخنەیەک کە دەتوانین لەم باسەی بگرین ئەوەیە کە بۆ روونکردنەوەی ئاماژەکان پێویست بەوە نییە بەڵگە لە بوونی خودا بهێنرێتەوە، کەسانێک وەک جان لاک هۆی ئاماژەکانیان لە زاتی ماددەدا زانیوە، هەروەها سەرتر لەوەش، گریمانەخوازە ئەشعەریەکان لەبەرئەوەی کە ناسینیان بە بەرهەمی چالاکبوونی ئاماژەکان و هەروەها بە بابەتێکی پەسیویان زانیوە، هاوکات تووشی چەند کێشە بوون کە هیچ کات سەرنجیان پێ نەدا، بۆ وێنە:

١. گریمانەخوازەکان بەم خاڵەیان نەزانی کە ئەگەر ناسین تەنها بە بابەتێکی زەینی بزانین، لەوکاتەدا ناتوانن هەڵە زەینیەکان بناسنەوە و هەروەها توانایی جیاوازی دانان لە نێوان وێنە دروست و هەڵەکانیان نابێت.

٢. گریمانەخوازەکان لەوە تێنەگەیشتن کە بەپێی تیۆری ناسینی ئەوان، هەموو کەس دەبێ مرۆڤەکانی تر وەک شتەکان بە نمودی زەینی و بە یەکێک لە حاڵەتەکان یان توخمەکانی شعوری خۆی بزانێت.

٣. گریمانەخوازەکان لەوە تێنەگەیشتن کە ئەگەر ناسین هەمان وەرگرتنی پەسیوی وێنەکان بێت، خودا کە هۆی وێنەکان و هۆی گەریانی ناسینە نابێ لەو شتەی کە داویەتی بە ئێمە ئاگادار بێت. ئەمەش بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ خوداناسی گریمانەخوازە ئەشعەریەکاندا سازگار نییە. ئاماژەکان لەکاتێکدا کە نایەنە ناو زەینی ئێمەوە بەپێی پێویست دەبێ لە ناو زەینی خودادابن، بەڵام هەروەک چۆن باسکرا تیۆری ناسینی ئەشعەری نکوڵی لە ئیمکانی وەها بابەتێک کردووە.

یەکێکی تر لە کێشەکانی تایبەت بە چییەتی ئەمەیە کە ئایا چییەتی خۆی خوڵقاوە یان نا؟ مەشائیەکان کە دژکارانیان ئەوانیان بە "حەکیم" ناو دەبرد حوکمیان دا بەوەی کە چییەتی شتەکان خوڵقاو نییە و ئەشعەریەکانیش ڕایەکی دژ بەمەیان هەبوو. بەپێی باسەکانی مەشائیەکان چییەتی ناتوانێت بچێتە ژێر کاریگەریی هیچ هۆیەکی دەرەکیەوە.

بە وتەی کاتبی ئەگەر چییەتی مرۆڤ بەرهەمی چالاکیەکی دەرەکی بێت کەواتە دەتوانین گومانی لێبکەین و بڵێین کە ئەم چییەتیە، تایبەت بە مرۆڤ نییە. لەهەمان کاتدا لەبەرئەوەی کە خاوەنداریەتی چییەتی مرۆڤ بۆ مرۆڤ حاشا هەڵنەگرە، دەبێ ئەوە قبووڵ بکەین کە چییەتی ناکرێ بەرهەمی چالاکی هۆیەکی دەرەکی بێت.

لە بەرامبەر ئەم تیۆریەدا گریمانەخوازەکان بە ئیشارەتکردن بە جیاکاریەک کە واقیعخوازەکان لە نێوان چییەتی و بووندا کردویانە، باسیان لەوە کرد کە لە روانگەی واقیعخوازیەوە مرۆڤ ئاوێتەیەکە لە دوو بابەتی نەخوڵقاو واتە بوون و چییەتی و کەواتە خۆی دەبێت نەخوڵقاو بێت. ئەمەش باتڵە.

## ٠٢ ناسین

مەشـائیەکان بەپێـی قبـووڵکردنی راسـتییە بینـدراوەکان کە لە چییەتـی سـەربەخۆیە، ناسـینیان بەمە پێناسـە کـرد: گەیـشتن بە وێـنەی شـتە دەرەکیەکان، پاشان بەرەو ئەوە چوون کە گەیشتن بە وێنەی شت گەلێک کە بوونی دەرەکیشیان نییە مسۆگەرە ئەگەر بتوانین چییەتی دیکەیان بۆ پەیدا بکەین، کاتێک بە شتێک چییەتی بوون بچەسپێنین، بوون راستەوخۆ پێویـست دەبێـت، لەبەرئەوەی کە بە پێویـست زانینـی چییەتـی بـۆ شـتێک بەشـێکە لە بـوونی ئەو شـتە، کەواتە ئەگەر هەڵگـری بـوون پێویـستی بە بوونی بیندراو نەبێت، دەبێ نکوڵی لە بوونی دەرەکی بکەین و ئەوە قبووڵ بکەین کە بوونێکی زەینییە.

سەبارەت بەم باسە شمس الدین محمد مبارک بانگەشـەی ئەوەی کرد کە پێویستیی بوونی شتێک واتە اثبات، بوونی وجود یان ثبوت داوا دەکات. بەم شێوازە ئەویش وەک دیکەی ئینکارخوازەکان لە نێوان اثبات و ثبوت دا هـیچ جیـاوازیەک دانانێـت. لەم باسـەوە نـاتوانین ئەم ئەنجـامە دەسـتەبەر بکەین کە شت، بابەتێکی زەینییە، بە زەینیی زانینی شتەکان هەڵگری ئەوەیە کە حاشا لە بوونی دەرەکی بکەین و ئەمەش لەگەڵ ئەندێشەی ئینکارخوازە ئەشـعەریەکاندا رێـک ناکەوێـت. ئەوان ناسـینیان بە نیـسبەتێک دەزانـی لە نێوان ناسێنەر و بابەتی ناسراوی دەرەکییدا، باسێکیش کە نجم الدین علی دبیـران کـاتبی سـەبارەت بەم بـابەتە کـرد دووالیـزم بەدوور نیـیە لە پارادۆکس.

کاتبی دەڵێت کە شتێک ئەگەر بێت و بوونی دەرەکی نەبێت دەبێ بوونی زەینـی هەبێـت، بەڵام بـەپێی پێوەرەکـانی خـۆی هەر شـتێک کە بگـاتە زەیـن کەواتە لەدەرەوەشدا بوونی هەیە.

## ٣. عەدەم

کاتبی بۆ روونکردنەوە و رەخنە لە بابەتێک کە لەلایەن هاوچەرخەکانیەوە پەسەند کرابوو هەوڵی دا، ئەو باسە بەم شێوەیە بوو: بوون خێرە و نەبوون خراپەیە یان شەڕ، قەتڵ یان کوشتنی کەسێک لەو لایەنەوە خراپ نییە کە بکوژ دەسەڵاتی وەها کردەوەیەکی هەیە یان ئامێری کوشتن بە بڕشتە یان ملی کوژراوەکە دەبڕدرێت، کوشتن خراپەیە لەبەرئەوەی دەبێتە هۆی نەفی کردنی ژیان و نەفی کردنی ژیان بە پێچەوانەی سێ بابەتی باسکراو بابەتێکی وجودی نییە، بابەتێکی نەبوون یان لاوجوودە، بۆ سەلماندنی ئەم خاڵە کە خراپە بابەتێکی لاوجودە دەبێ شێوازی ئیستقرائی هەڵبژێرین و گشت خاڵەکانی خراپە لێکبدەینەوە. ئیستقرائی گشتی ئەستەمە و ئیستقرائی ناکاملێش نامانگەیەنێتە ئەنجام، کاتبی ئەو باسەی وەلانا و هاتە سەر ئەم باوەڕە کە: "لاوجود هیچی رەهایە".

لە روانگەی کاتبییەوە چییەتیەکان لە چاوەڕوانی وەرگرتنی سیفەتی بووندا لە شوێندا دانەمەزراون لەبەرئەوەی لەوەها کاتێکدا دەبێ شوێن بە نەبوون بزانین، کەسانێک کە بە رەخنەگرتنێکی وردەوە سەرنجیان دایە ئەو تیۆریەی کاتبی باسیان لەوە کردووە کە هۆهێنانەوەکەی ئەو تەنها لە حاڵەتێکدا کە ثبوت لە شوێندا بە یەکێک بزانین لەگەڵ بووندا بە راست دەردەچێت. بەپێی روانینی ابن مبارک، ثبوت لەدەرەوەدا چەمکێکی بەربڵاوتری هەیە لە چەمکی بوون، بوون سەرانسەر دەرەکیە، بەڵام ئەو شتەی کە دەرەکییە نابێ حەتمەن بوونی هەبێت. ئەشعەریەکان لەبەرئەوەی کە باوەڕیان بە قیامەت یان ئیمکانی زیندووکردنەوەی مردووەکان هەبوو واتە کردنی عدم بە وجود، بانگەشەیەکی بەتاڵیان ئاراستە کرد و وتیان کە هیچ یان لاوجود خۆی شتێکە لەبەرئەوەی دەتوانین سەبارەت بە عدم یان

نەبوون حوکم بکەین، کەواتە دەبێ نەبوون بە بابەتێکی ناسراو بزانین و ناسینی نەبوون ئەوەمان پیشان دەدات کە نەبوون هیچی رەها نییە و عدم بابەتێکە کە دەکرێ بیسەلمێنین.

کاتبی ئەم قیاسکردنەی بە بابەتێکی راستەقینە نەدەزانی و دەیوت کە زۆر شت هەن کە ناسراون، بەڵام بوونی دەرەکیان نییە. فخرالدین رازی ئەم رەخنەی رەتکردەوە و کاتبی بە نەزان ناوبرد لەبەرئەوەی لەم خاڵە تینەگەیشتبوو کە چییەتی لە ناو زەیندا بوونی هەیە و بەم شێوەیە وەک بابەتی دەرەکی دەناسرێت. کاتبی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ناسینی شتێک پێویستی بەوە هەیە کە ئەو شتە لە شێوازی واقیعێکی بیندراو و سەربەخۆ بوونی هەبێت، هەروەها نابێ ئەوە فەرامۆش بکەین کە ئەشعەریەکان لە لایەکەوە لە نێوان بابەتی ئیجابی و بابەتی وجودی و هەروەها لەنێوانی بابەتی سلبی و بابەتی لاوجودی دا جیاوازیان دادەنا. دەیانوت کە بوون یەکسەرە ئیجابییە و بەڵام پێچەوانەکەی راست نییە. بێگومان لە نێوان بوون و نەبووندا پەیوەندییەک هەیە، بەڵام بە هیچ شێوە لە نێوان ئیجابی و سلبییدا پەیوەندی لە ئارادا نییە، بە پێچەوانەی بیروڕای کاتبی، پەیدا بوو بابەتی عدم نییە بەڵکو سلبییە و جەوهەرێک کە بوونی هەیە بابەتی ئیجابییە، دەرکەوتەیەک کە بوونی بێ جەوهەر وێنە ناکرێت نە بە بوون ناوی دەبرێت و نە بە نەبوون، بەڵکو شتێکە لە نێوان ئەو دووانەدا. کورتەی کەلام ئەوەیە کە بەپێی باسەکانی ئەشعەریەکان بوونی بابەت یان هۆیەکی هەیە یان نییە، ئەگەر هەیەتی بە سلبی دەناسرێت و ئەگەر نییەتی کەواتە یان جەوهەرە یان دەرکەوتە، ئەگەر جەوهەر بێت و خاوەنی سیفەتی بوون یان نەبوون بێت واتە ئیدراک بکرێت یان نەکرێت کەواتە بوون واتە وجود یان نەبوون واتە عدم دەبێت. ئەگەر دەرکەوتە بێت نە بوونە و نە نەبوون.

# تەسەوف

## ١. سەرچاوەی تەسەوف و بوارەکەی لە ناو قورئاندا

لە نــاو رۆژهەڵاتناســانی هاوچەرخــدا ســەرنجدان بە سلــسلەی رووداوەکـان یـان گەڕان بە شـوێن بـواو و سـەرچاوەی شـتەکان بـۆتە نەریتێکـی بـاو، بێگومـان ئەم نەریـتە بـایەخێکی مێژوویـی زۆری هەیە، هاوکات نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە زەینی مرۆڤ خـاوەنی تاکایەتییەکی سـەربەخۆیە و پێـدەچێت کە لە بـارودۆخێکی کۆمەڵایەتییـدا بگـاتە هەنـدێ راسـتی کە بەرلەوە لە شـوێنەکانی تـردا لە لایەن هەنـدێ کەسـیترەوە دۆزرابێتەوە. هیچ بیرێک لەلایەن هۆزێکەوە پەسـەند ناکرێت مەگەر ئەوەی کە بە جۆرێـک پـەیوەنـدی هەبێـت بەسـەر ژیـانی ئەو هـۆزەوە، هـۆ دەرەکیەکان برێجار دەتوانن رۆحی هۆزێک لە خەوی بێ ئاگایی هەڵبستێنن بەڵام هەرگیز توانای ئەوەیان نییە کە ئەو رۆحە دروست بکەن.

سەبارەت بە سەرچاوەی تەسەوفی ئێرانی گەلێک باس کراوە، بە لانی کەمەوە هەموو قوتابیانی ئەم بوارە دڵخوازە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەگەلێک کە بگاتە تەسەوف، هەوڵێکی زۆریـان داوە. زۆربەیـان لەبیریـان چۆتەوە کە لە مێـژووی کـامڵبوونی عەقڵـی هۆزێکدا واتـای هەر رووداوێـک تەنیـا لە ژێـر تیــشکی بــارودۆخی فکــری و سیاســی و کــۆمەڵایەتی ئەو رووداوەدا دەردەکەوێـت و ئەگەر ئەم بـارودۆخە لە ئـارادا نەبێـت، هەر لە بـنەڕەتەوە پێویستیی رووداني ئەو بابەتە لە ئارادا نابێت.

فون کرومێر Von Kremer و هەروەهـا دۆزی Dozy سـەرچاوەی تەسـەوفی ئێرانیـان گەڕانـدۆتەوە بـۆ وەدان تـای هینـدوەکان، مێـرکیس و نێکیلسۆن تەسەوفی ئیرانیان لە ناخی فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونی دەرکێشا و براون، هەندێ جار ئەم تەسـەوفەی بە پەرچەکردارێکی ئاریـایی دەزانـی

له بەرامبەر دینی چەقبەستووی سامیەکان. بە باوەڕی من گشت ئەم تیۆریانە لەسەر چەمکێکی هەڵەی هۆیەتی دامەزراون، لەبەر ئەوەی کە بابەتە زانستیەکان زۆرجار بابەتی هۆیەتیین و هەر بابەتێکی وەها لەسەر دوو بەش دامەزراوە کە چەندایەتی دیاری "ئەلف" دەبێتە هۆی چەندایەتیەکی دیاری دیکە بە ناوی "ب". ئەم بابەتانە هەرچەند زۆر بەسوودن، بەڵام نابێ لەوە غافڵ بین کە لە هەر رووداوێکدا گەلێک بارودۆخی ئەژمار نەکراو کاریگەریەتیان هەیە و لەو کاتەدا زۆرێک لە توێژینەوەکان تووشی ئاسی و دەبن، بۆ وێنە ئەگەر بڵێین کە رووخانی ئیمپراتۆری رۆما لە ئەنجامی هێرشەکانی وەحشەکان بوولە باری مێژووییەوە تووشی هەڵە بووین، چونکە وەها تیۆرییەک چاوپۆشی لەو گشتە هۆیە دەکات کە بووە لێکترازانی یەکیەتی سیاسی رۆما. توێژەرێک کە هێرشەکانی وەحشەکان بە تەنها هۆی روخانی رۆما بزانێت ئەوە فەرامۆش دەکات کە رۆما توانی بە سوڵتەی فەرهەنگی خۆی وەحشەکان واتە هۆی رووخانەکەی لە ناو خۆدا بتوێنێتەوەو لە پراکتیکیشدا وای کرد. کەواتە وەها داوەریەک لە باری لۆژیکەوە هەڵەیە.

بۆ روونکردنەوەی تەسەوف دەبێ بە پێی هۆیەتی دروست کۆمەڵگەی ئیسلامی هەڵسەنگێنین و بەتایبەت بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فکری سەدەکانی دووهەم و سێهەمی کۆچی لێکبدەینەوە، لەم سەدانەدا بوو کە ئارمانە سۆفییانەکان پەیدا بوون و زوو پاساوی فەلسەفییان پەیدا کرد. لێرەدا باس لە پێشەکی دەرکەوتنی تەسەوف دەکەین:

١. کاتێ مێژووی ئێران موتاڵا دەکەین دەبینین کە سەدەکانی دووهەم و سێهەمی کۆچی رۆژگارێکی نائارامی سیاییە، لە نێوان سەدەی دووهەمی کۆچی بەدەر لە شۆڕشێکی سیاسی گەورە کە بووە هۆی لەناوچوونی بنەماڵەی ئەمەوییەکان، رووداوی گەورە وەک ئازادکردنی زەندەقیەکان و شۆڕشەکانی مورتە ئێرانییەکان وەک سنباذ و استاذسیس و المقنع

پێغەمــبەری دەمامکـداری خوراســان خولّقـا کە کەڵکــی لە ســاویلکەبوونی خەڵک وەرگرت. لامەنە Lamennais لە ئەوروپای هاوچەرخدا لەوکەسانە بــوو کە تەرحە سیاسـیەکانی خــۆی لە شــێوازی ئاینییــدا دەرخــست و لە ئێرانیشدا وایلێهات. پاشان لە کۆتایی سەدەی دووهەمدا کوڕەکانی هاروون واتە مەئمـون و ئەمـین بۆ بەدەسـتهێنانی یەک پـارچەیی سیاسـی دەسـتیان دایە شەڕێکی خوێناوی، پاش ئەوە سـەردەمی زێڕێنی ئەدەبیاتی ئیسلامی دەستی پێکرد و شۆڕشـی بـابەک مەزدەکی هێمنـایەتی کۆمەڵگەی شـێواند. ساڵانی سـەرەتای خەلافەتی مەئمـون لەگەڵ ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی تـر کە گرنگــایەتییەکی سیاســـی مەزنـــی هەیە هاوکـــات بـــوو. بەم واتـــایە کە بزووتنەوەی شعوبیان دەستیپێکرد و بە حکومەتی سیلسیلە سـەربەخۆکانی ئێران واتە تاهیریەکان و سەفاریان و سامانیان پێشکەوت.

وەهــا ڕووداوگەلێـک کەسـە دوورەپەرێـزە خواپەرسـتەکانی لەو هەرای شــەڕە دوور کــردووە و بەرەو ژیــانی هێمنــی مەعــنەوی بــردن. ئەمــان لەســـەرەتادا بە شــێوازێکی عارفــانە بیریــان دەکــردەوە، بەڵام بەرەبەرە زوهـدی ئەوان گـۆڕدرا و بـووە گشت خـواییەکی نەرم و نیـان کە لایەنـی ئاریــایی هەبــوو. هــاوتەریبی گەڕیــانی ســەربەخۆیی ئێــران کە بەرە بەرە خەریک بوو بەهێز دەبوو، ڕۆیشتە پێشەوە.

٢. فیــرقەی مـــوعتەزیلە بە هزرخـــوازیی خۆیـــان چەکەرەی شـــک و گومانیان لە جیهانی ئیسلامدا خستەوە، یەکێک لە یەکەمین دەرکەوتەکانی ئەم شـکە لە شـیعرەکانی بەشــار، شــەکاکی نابینــای ئێرانــی دایە، بەشــار لایەنێکی خـوایی بەخشیە ئـاگر و گـاڵتەی بە شـێوازە فکریە نائێرانیەکـانی کـرد، شـکخوازیی ئیـسلامی هەرچەنـد لە دایکبـووی هزرخـوازییە، بەڵام لە ئاکامدا خاوەن هزرەکـانی وروژانـد کە بە شـوێن مەعریفەیەکدا بگەڕێن کە سەرچاوەیەکی سەرتر لە هزری هەبێت، بە بەرەکەتـی وەهـا گەڕانێک بـوو کە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا بوو کە رسـلە قشیریە پەیدا بـوو، هەروەک

چۆن له سەردەمی ئێمەدا بە هۆی بەدواهاتە نێگەتیڤەکانی کتێبی رەخنە لە هزری رەها بەرهەمی کانت کەسانێک وەک یاکوبی یان شلاییر ماخێر روویان کردە دۆزینەوە و شهود و هەروەها شاعیری شەکاک ڤۆردیرز ڤێرس هەوڵی دا پەردە لەسەر ئەو حاڵەتە سەیرە لابدات کە ئێمە سەرتاپا دەبینە رۆحێک و دەچینە ناو شتەکانەوە.

٣. پاش مەرگی مەئمون مەزهەبە ئیسلامیەکان واتە حەنەفی و شافیعی و مالیکی و بەتایبەت حەنبەلی کە لە دەلاقەی مرۆڤخوازیەوە (Anthropomorphism) دەیڕوانیە جیهان و گەورەترین دوژمنی سەربەخۆیی فکری بوو بەسەر جەماوەردا زاڵ بوون. خاوەن دڵەکان لە بەرامبەر ئەم مەزهەبانەدا هەوڵی دروستکردنی ئایینی دیکەیان دا.

٤. ئەو شەڕە ئایینیانەی کە بە هاندانی مەئمون لە نێوان نوێنەرەکانی ئایینە جیاوازەکاندا و بەتایبەت ئایینی موعتەزیلە و ئەشعەری روویدا، زەینی زۆر کەسی لە هەراو هوریا و دەمەقاڵە و باسکردن رەواندەوە و روویان کردە ئاسۆی بەرفراوانی حەقیقەتی دیکە.

٥. لە ژێر سێبەری هزرخوازی سەردەمی عەباسییدا غیرەتی ئاینی بەرەبەرە نەرمتر بوو، هەروەها زۆربوونی خێرای پارە و سامان چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی والێکرد کە لە بواری ئەخلاقدا ئاسانگیر بن و بێ سنوور ببن، هەربۆیە هەستیان بە پێویستی ئایینیکی نەرم و نیانتر کرد.

٦. مەسیحیەکانی جیهانی ئیسلام بەرەبەرە موسوڵمانەکانیان لەگەڵ ئامانجەکانی خۆیان ئاشنا کرد، بنەماکانی مەسیحیەت و بەتایبەت ژیانی پراکتیکی راهیبە مەسیحیەکان کاریگەریەتی لەسەر قودسیە ئیسلامیەکان دانا و ئەوانی کێشایە ناو زوهدێکی کامڵ کە بە باوەڕی من لەگەڵ رۆحی ئیسلامدا دژایەتی هەیە.

تەســـەوف لە وەهـــا بارودۆخێکـــدا ســـەری هەڵـــدا و کەواتە دەبـــێ سەرچاوەی کامڵبوونی چەمکە سۆفیانەکان لەم دۆخەدا بدۆزینەوە، ئەگەر وەژا کەش و هەوایەک و هەروەها یەکخـوازیی پێشینی ئێرانیەکـان بخەینە بەر ســـەرنج، چیرۆکـــی ســـەرهەڵدان و گەشـــەکردنی تەســـەوف بـــاش دەردەکەوێت، ئایینی نوێ ئەفلاتوونیش کە زۆر لە تەسەوف دەچێت لەوەها بارودۆخیکدا ساز کرا. لە دەڤەری دەوڵەتی رۆما هێرشەکانی وەحشەکان کە ئیمپراتۆرە کۆشکنشینە رۆمیەکانی کرد بە ئیمپراتۆرە کۆچنشینەکان، لە ناوەڕاستی سەدەی سێهەمی مەسیحییدا مەترسیدارتر بوو وەها کە مێشکی زۆر کەسی بەخۆوە سەرقاڵ کرد. داڕێژەری دەزگای نوێ ئەفلاتوونی واتە پلۆتینیۆس لە یەکێک لە نامەکانییدا بۆ فلاکۆس باسی لەم بێ ئـارامییە کردووە. لە زێدی ئەو واتە ئەسکەندەریە خەڵک بە لێبوردەییەوە سـەیری ژیـانی ئایینیـان دەکـرد، بەڵام بـارودۆخ بەرەو خـراپە رۆی، لە رۆمـاش کە پێگەی ئایینە جیاوازەکان بوو ژیانی گشتی لە پراکتیکدا بووبووە یاری و فـسق گەیـشتبووە قـولایی ژیـانی چینەکـانی ســەرەوەی کـۆمەڵگە. کـۆڕە فەرهەنگیەکانی رۆما فەلسەفەیان نەوەک بە شێوازێکی جیدی بەڵکو وەک لقێکـی ئەدەبیـات موتـالا دەکـرد. لە بەرامـبەردا ئـانتیکۆس Antiochus دەیهەویـست شـکخوازی لەگەڵ ئـاییـنی رەواقییـدا تـێکەڵ بکـات، سێکستیۆن ئیمپیریکـۆس ( Sextus Empiricus) پەرەی بە شــکخوازیی دەســـت لێنەدراوی پێرهۆن دا. شکی پێرهۆن هیچ نەبوو بێجگە لە خەمۆکی عەقڵـی و هەر ئەم خەمۆکی عەقڵیەش بوو کە پلۆتینیۆسی لە عەقڵ بێزار کـرد و بە شـوێن حەقیقەتـدا گەیـشتە جیهـانی موکاشـەفە. لەمـانەش تێپەڕین بە هـۆی ئەخلاقی وشـک و رەقی رەواقـی و خـۆپەرێزی نەرمـی مەسـیحیەکان کە بە هـۆی ئەشـکەنجە درنـدانە و بەردەوامەکـانەوە بێ بـاک بووبـون و پەیـامی ئاشـتی و میهرەبانیـان دەگەیانـدە سەرانـسەری جیهـانی رۆمـیەوە پێویـستی بابەتێک دەرکەوت. ئەویش ئەمە بوو کە سیستمە فەلسەفیەکانی موشـریکە

ڕۆمیەکان سەرلەنوێ ساز بکرێتەوە و ئامانجە دێرینەکانی ژیان لەگەڵ نیازە مەعنەویە نوێکاندا بگونجێت. لەم کاتەدا بوو کە فەلسەفەیەکی نوێ – فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونی – پێکهات. ئەم فەلسەفەیە زیاتر لە مەسیحیەت پەیوەست بوو بە ما بعد الطبیعە و هێزێکی ئەخلاقی و زانستی گەورەی وەرنەگرت و هەربۆیە وڵامدەری پێویستیەکانی زۆربەی خەڵک نەبوو.[1]

وەحشیە توندڕەوەکان کە لە کرداری مەسیحیە زوڵم لێکراوەکان گڕوتینیان گرتبوو بوونە مەسیحی و بە بەرەکەتی ئەوە ژیانێکی ئارامیان گرتە بەر و لەسەر کەلاوەکانی ئیمپراتۆریە دێرینەکاندا ئیمپراتۆریەکی نوێیان ساز کرد.

لە ئێرانیشدا بە هۆی دزەکردن و پێکدادان و پەیوەندییە فەرهەنگیەکانەوە هەندێ کەس بەرەبەرە هەوڵی سازدانەوەی ئیسلامیان دا و بەو شێوە ئامانجەکانی مەسیحیەت و فکری گنۆستیکە مەسیحیەکانیان وەرگرت و لەسەر ڕاهینانەکانی قورئان ڕایانوەستاند. ئەم سوورە گوڵە ئێرانیە لە کاتی خۆیدا گەشەی کرد و تەنانەت ژەهرەکانی هێرشی ابن تیمیە نەیتوانی بیژاکێنێت. لە حاڵێکدا کە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمادا گوڵی فەلسەفەی یۆنانی لە بەرامبەر هەناسەی مەسیحیەتدا یەکسەرە ژاکا و ئەم گوڵە بە هێرشی وەحشیەکان لە ڕیشە دەرهات. ئەو سوورە گوڵەی دیکە تەنانەت لە هێرشی تاتارەکان تووشی هیچ نەهات و هەروا تا سەردەمی ئێمە زیندوو مایەوە.

ئەگەر لە تان و پۆی سیستمی تەسەوف ورد ببینەوە لەو گۆڕانکاریە تێدەگەین کە ئەم سیستمە لە ڕێگەی لێکدانەوەی باوەڕە ئیسلامیەکانەوە دروستی کرد. دەتوانین بڵێین کە ڕاهێنانی هۆزە سامیەکان بۆ گەیشتن بە

---

[1] مامۆستا نوێکانی فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونی ئاوریان نەدایەوە لە توخمی "خلسە" کە دەیتوانی زۆر سەرنج بەرەو خۆی ڕاکێشێت. بەم شێوەیە فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونیان بە شێوازی سیستمێکی فکری دەرهێنا کە هیچ جۆرە جەزەبەیەکی مرۆیی نەبوو.

سەرکەوتن ئاوەها بوو: "ئیرادەی خۆت بگۆڕە". لەم وانەیە دەردەکەوێت کە سـامیەکان ئیرادەیـان بە زاتـی مـرۆڤ زانیـوە لە حاڵێکـدا کە دیتـران و پەیڕەوەکان یوەدان تـای هیندی ئەمەیـان فێر کردووین کە گشت ئـازار و دەردەکان لەو روانینە هەڵانەوە دێن کە ئێمە لە بەرامبەر جیهاندا هەمـانە و هەربـۆیە بـۆ سـڕینەوەی ئازارەکـان دەبـێ تێگەیشتنی خۆمـان بگـۆڕین. بە باوەڕی ودان تـا، زاتـی مـرۆڤ چالاکی یـان ئیـرادە نییە بەڵکو هەمـان بیـر کـردن و تێگەیـشتنە. لە روانـگەی تەسـەوفدا گەیـشتن بە هێمنـایەتی بە گۆڕانکـاریی لە تێگەیـشتندا دەسـت ناکەوێـت و نە بە گـۆڕینی ئیـرادەش. گۆڕانکـاری بیـر و گۆڕانکـاری ئیـرادە لە ژێـر تیـشکی گۆڕانکـاریی لە نـاو هەستەکاندا دەردەکەوێت. لە راستیشدا ئیـرادە و تێگەیشتن روزسـارگەلی هەستە مرۆییەکانن. پەیامی سۆفی بۆ مـرۆڤ ئەمە بـوو: "هەموانـت خـۆش بوێـت و کە چـاکە دەکەی لەگەڵ خەڵکـدا، خـۆت لە بیـر بـکە". لەم بـارەوە جەلال الدین بلخی فەرموویەتی:

بایزید اندر سفر جستی بسـی
تا بیاید خضر وقت خود کسی
دید پیری با قدی همچون هلال
دید در وی فر و گفتار رجـال
دیده نابینا و دل چون آفتـاب
همچو پیلی دیده هندستان به خواب
چشم بسته، خفته بیند صـد طرب
چون گشایش آن، نبیند ای عجب
بس عجب در خواب، روشن می شود
دل درون خـواب، روزن می شـود
آنکه بیدارسـت، بیند خواب خوش
عارف است او، خاک او در دیده کش
پیش او بنشست می پرسید حـال

یافتش درویش و هم صاحب عیال
گفت: عــزم تو کــجا ای بـــایزید؟
رخت غربت تا کجا خواهی کشید؟
گفت: قصد کعبه دارم از پگـه
گفت: هین با خود چه داری زاد ره ؟
گفت: دارم از درم نفره دویست
نک ببسته سخت بر گوشه ردی است
گفت: طوفی کن به گردم هفت بار
وین نکوتر از طواف حج شمار
و آن درم ها پیش من نه ای جواد
دانکه حج کردی و حاصل شد مراد
عمره کردی عمر باقی یافتی
صاف گشتی، بر صفا بشتافتی
حق آن حقی که جانت دیده است
که مرا بر بست خود بگزیده است
کعبه هر چندی که خانه بر اوست
خلقت من نیز خانه سر اوست
تا بکرد آن کعبه را دروی نرفت
واندرین خانه بجز آن حی نرفت
چون مرا دیدی خدا را دیده یی
گرد کعبه صدق برگردیده یی
خدمت من طاعت و حمد خداست
تا نپنداری که حق از من جداست
چشم نیکو بازکن در من فکر
تا ببینی نور حق اندر بشر
با یزید آن نکته ها را هوش داشت
همچو زرین حلقه اش در گوش داشت

آمد از وی بایزید اندر مزید
منتهی در منتها آخر رسید.

بۆ بەئەنجامگەیاندنی وەها دەستوورێک دەبێ لە "بۆ چی؟"و "چۆنیەتی؟" تێبگەین. دەبێ بزانین کە چ ئامانجگەلێک درککردنی مرۆڤ باشتر دەکەن و کام شێوازانە بۆ رێنمونی ئیرادەی مرۆیی شیاوترە. تەسەوف وەلامی ئەم دوو پرسیارەی داوەتەوە، سۆفیەکان نە یاسا چەقەکانی سامیەکان سەبارەت بە ئیرادە و کرداری مرۆیی بە بەس زانیوە و نە لە سنووری بنەما عەقلّیە وشکەکانی وادان تای هیندی دا راوەستان، بەلّکو بە هێزی دەروونناسی گشتی خۆیان ئەو دوو شێوازە سامی و ئاریاییەیان تێکەلّ کرد و هەوێنی ئایینی عەشقیان گرتەوە.

لە لایەکەوە چەمکی بودایی فەنا یان نیروانایان قبوولّ کرد و سیستمی فەلسەفییان لەسەر ئەوە دامەزراند، لە لایەکیترەوە بەهرەیان لە ئیسلام وەرگرت و جیهانبینی خۆیان بە متمانەی قورئانەوە دارشت، هەروەک چۆن زێدی تەسەوف واتە ئێران لە ناوەندی ولاتە رەسەنەکەی ئاریاییەکان و ولاتی سامیەکاندا بوو، تەسەوفیش لە تێکەلّبوونی باوەڕە ئاریایی و سامیەکان دروستکرا، لەمبارەوە دەبێ چاوپۆشی لە دوو خالّ نەکەین، خالّی یەکەم ئەوەیە کە لایەنی ئاریایی تەسەوف زالّە بەسەر لایەنی سامی و خالّی دووهەمیش ئەوەیە کە لەو تێکەلاویەدا توخمە ئاریایی و سامیەکان وەها تووشی گۆڕان بوون کە تەسەوف لە هەردووکیان سەربەخۆ بووە. تەسەوف بە ڕوانینێکی گشت لایەنە و قوولّ دەڕوانێتە کەسایەتی مرۆڤ و لەگەلّ تەبعی مرۆڤایەتییدا زۆرباش دەگونجێت. نهێنی ئەو هێزە گەورەی تەسەوف هەر لەم خالّەدا دەردەکەوێت و ئەم ئایینە سەرەڕای ئەو هەموو گوشارانەی خاوەن شەرعەکان و لە جەنگی شۆڕشە سیاسییەکاندا هەر مایەوە. تەسەوف لە هەمانکاتدا کە سەرکوتکاریی نەفس بە بنەڕەتی ژیان دەزانێت چالاکی عەقلّ بۆ مرۆڤ بە باش دەزانێت.

هەنـدێ لە تـوێژەران بنـاغەی تەسـەوفیان لە نـاو ژیـانی و بە تـایبەت راهێنانەکانی پێغەمبەردا دۆزیوەتەوە، بەڵام لەمبارەوە هیچ دۆکیۆمێنتێکی مێژوویی بوونی نییە، ناکرێ ئەوە قبووڵ بکرێت کە پێغەمبەر لەم باسەدا وانەی نهێنی دابێتە عەلی یان ئەبوبەکر، سۆفیەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە پێغەمبەر بەدەر لەو زانستەی کە لە کتێبەکەیدا هاتووە، خاوەنی زانستی خەفی بووە و فێری کەسانێکیشی کردووە، دۆکیۆمێنتی سۆفیەکان لەم بارەوە ئایەتێکی قورئانیە: "ئێمە لە نێوان ئێوەدا پێغەمبەرێکمان بۆ ئێوە ناردووە کە ئایەتەکانی ئێمە بۆ ئێوە دەخوێنێتەوە و ئێوە پاک دەکاتەوە و کتێب و حیکمەتتان فێر دەکات و ئەوەی پێشتر نەتاندەزانی فێرتان دەکات"، سۆفیەکان دەیانوت کە مەبەست لە حیکمەت ئەو زانستەیە کە لە کتێبدا نەهاتووە، بەو شێوەیە کە پێغەمبەر چەندین جار باسی کردبوو ماددەکانی کتێب لە لایەن پێغەمبەرەکانی بەرلەویش هاتبوو و بێجگە لەوە، ئەگەر حیکمەت لە ناو کتێبدا هەبێت ئیتر وشەی "حیکمەت" زیادەیە.

بە باوەڕی من بە ئاسانی دەکرێت کە ڕەگ و ریشەی تەسەوف دەکرێ لە ناو قورئان و حەدیسە راستەکاندا بدۆزرێتەوە، عەرەبەکان زۆر دڵبەستەی ژیانی پراکتیکی بوون، تەسەوف لە عەرەبستاندا گەشەی نەکرد و بەهرەی نەبوو، لە خاکی نامۆدا بوو کە تۆخمی تەسەوف بوارێکی شیاوی پەیدا کرد و ڕوا و بە شێوازی ئاینێکی سەربەخۆ دەرهات. قورئان موسوڵمانانی ئاوها پێناسە کرد؛ "ئەوانەی کە ئیمانیان بە غەیب هەیە و نوێژ دەخوێنن و شتێک ئینفاق دەکەن لەوەی پێمان بەخشیون"، بەڵام چییەتی و کوێی غەیب خۆی دەکرێ توێژینەوەی لەسەر بکرێت، قورئان رایگەیاند کە غەیب لە ناو رۆحی مرۆڤدایە و هەروەها "لە زەویدا بۆ ئەوانەی یەقین دەکەن ئایەتێک هەیە و لە ئێوەشدا، ئەی بۆ نابینین"، هەروەها "ئێمە بە نیسبەت ئەو، مرۆڤ لە ڕەگی مل نزیکترین". بەدەر لەوە ئەم کتێبە پیرۆزە ئەوەی گەیاندووە کە زاتی غەیب نوورە "خوا رۆشنایی

ئاسمانەکان و زەویە"، بەڵام ئایا "نووری ئولا" خاوەن کەسایەتییە یان نا؟ قورئان لە زۆر شوێندا ئاماژەی بە نووری ئولا کردووە و لە هەمان حاڵدا ئاماژەی بە کەسایەتی نووری ئولا داوە، هەروەها بە چەند وشەی کورت هەواڵی داوە کە "هیچ شتێک وەک ئەو نییە". لێکۆڵینەوە سۆفیەکان یەکیەتی بابەتە پەسەندکراوەکانی خۆیان لە هەندێک لە ئایەتەکانی قورئانەوە وەرگرتووە و بە متمانەی ئەم ئایەتانە پەروەردەکردنی رۆحیان بە چوار قۆناغ ئەژمار کردووە: رۆح کە ئەمری خودایە و بێ ئەوەی کە لە ئاستی باودا ئەولاتر بڕوات و لەگەڵ سەرچاوەی کۆتایی گشت شتەکان ببێتە یەک و هاوڕەنگ بێت، دەبێ لەم چوار قۆناغە تێپەڕێت و لە هەر قۆناغێکدا هەوڵبدات:

**ئەلف**- دەبێ بەرەو رووی غەیب بڕوات.

**ب**- دەبێ سەبارەت بە غەیب تویژینەوە بکات و ئەم لێکۆڵینەوە بە سەیرکردنی نمودە سەیرەکانی سرووشت دەست پێدەکات، "ئایا نابینن وشتر چۆن پێکهاتووە، ئاسمانەکان چۆن هەڵپەستێراون و کێوەکان کە چۆن سەقامگرتوون؟".

**پ**- دەبێ "غەیب" بناسێت و هەروەک باسکرا ئەم ناسینە کاتێک دەست دەکەوێت کە رۆح قووڵایی خۆی ببینێت.

**ت**- دەبێ لەگەڵ غەیبدا هاوشێوە بێت و ئەم بابەتە پەیوەستە بە دادپەروەری و چاک کرداری "بە دروستی کە خوا فرمان دەدات بە دادپەروەر بن و چاکە بکەن و ئەوەی شیاویانە بیدەن بە نزیکەکانتان و ئەو ئێوە لە خراپە و لە ناشیرینی دوور دەخاتەوە".

لە سەردەمی دواییدا هەندێک لە فیرقەکانی سۆفی وەک فیرقەی نەقشبەندی بۆ گەیشتن بە کەماڵ شێوازگەلێکی تریان لە ودان تای هیندیەکان وەرگرتووە، ئەم فیرقانە وەک ئایینی کۆندالینی هیندووەکان باسیان لەوە کرد کە لە ناو جەستەی مرۆڤدا شەش ناوەندی گەورەی نوور هەیە و نووری ئەو

سـەنتەرانە رەنگـی جیاوازیـان هەیە، سـۆفی دەبـێ هەوڵبـدات کە لە رێـگەی بیرکـردنەوە ئەم ناوەنـدانە بخـاتە جـووڵە تـاکو لە ئەنجـامی کـاردا لە گـشت چەشنی رەنگەکان کەمبکاتەوە و بگاتە نووری بێ رەنگی ڕەسـەن کە خۆی نەبینـدراوە، بەڵام هەمـوو شـتێک بینـدراو دەکـات، جـووڵەی بەردەوامـی ناوەندەکانی نوور و گەیشتن بە نووری بێ رەنگ کە لە جووڵاندنی پاژەکانی جەستە لە لایەنێکی دیاریکراودا و دووپاتکردنەوەی ناوەکانی خودا و هەروەها وشە نهێنیەکانی دیکە مسۆگەر دەبێت، سەرانسەری جەستەی سۆفی رووناک دەبێـتەوە و بە درککردنـی ئەم روونـاکیە هەسـتی نـامۆیی لە بەیـن دەچێـت. پەرەسـەندنی ئەم جۆرە شـێوازانە لە نـاو سـۆفیەکانی ئێرانـدا فـۆن کرەمێـری گەیانـدە ئەم بـاوەڕە کە هەمـوو تەسـەوفی بە لە دایکبـووی وادن تـای بزانێت، بەڵام دیـارە کە ئەم شـێوازانە لە بـنەڕەتەوە نائیـسلامیین و نەکەوتـنە بەر سەرنجی سۆفیە پلە یەکەکان.

## ٢. گرووپەکانی حیکمەتی سۆفیانە

لێرەدا ئاوڕ لە لایەن و گرووپەکانی فەلسەفەی تەسەوف دەدەینەوە، هەڵسەنگاندنی وردی ئاسەواری سۆفیەکان ئەوە دەردەخات کە تەسەوف لە سێ لایەنەوە کە لە راستییدا یەکتر کامڵ دەکەن روانیویەتیە حەقیقەتی کۆتایی، هەندێ لە سۆفیەکان حەقیقەتی بوونیان ئیرادەی خود- ئاگا زانیوە و هەندێکی تر ئەوەیان بە جوانی زانیوە و هەندێ کەس ناویان ناوە فکر یان مەعریفەت یان نوور.

### گرووپی ئەسحابی ئیرادە

ئەم گرووپە لە باری مێژوویەوە فەرز بووە بەسەر گرووپەکانی دیکەدا و کەسانێکی گەورەی وەک شەقیقی بەڵخی و ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم و رابیعەی عەدویەی پەروەردە کردووە. لە روانینی گرووپی ئەسحابی ئیرادەوە حەقیقەتی نیهایی هەمان ئیرادەیە و جیهان هیچ نییە بێجگە لە چالاکی سنوورداری ئەو ئیرادەیە. ئەم گرووپە لە بنەڕەتدا باوەڕی بە خوایەک هەبوو کە لە بوون بەدەرە و هەربۆیە زیاتر لە گرووپەکانی تر رەنگی سامی هەبوو، ئەسحابی ئیرادە مەعریفەتیان بە ئامانجی خۆیان نەدەزانی بەڵکو بە هاندانی زوهد و خوادۆستیەکی قووڵ کە بەرهەمی هەستیاربوونی ئەوان بوو بەرامبەر بە تاوان، سلووکیان دەکرد، حەزیان لە داڕشتنی فەلسەفی نەبوو و تەنها هەوڵیان دەدا کە بەشێوەی پراکتیکی پەیوەندیان بە ئامانجی خۆیانەوە هەبێت، ئەم گرووپە لەم لێکۆڵینەوەیەی ئێستاماندا زۆر جێگەی گرنگی پێدان نین.

**گرووپی ئەسحابی جەمال**

مەعروفـــی کەرخـــی لە ســـەدەی دووهەمـــی کۆچییـــدا تەســـەوفی بە وەرگرتنی حەقیقەتە ئیلاهیەکان زانیوە، لەم پێناسـەوە ئاوەهـا دەردەکەوێت کە ئاﻳینی بەناوبـانگی کەرخی جەخت دەکاتە سەر مەعریفەت و هەروەهـا کە ئـاﻳینی ئەســحابی ئیـرادە لەســەر ئیمــان جەخــت دەکــات، لە ســەدەی پێنجەمــدا ابوالقاســم عبــدالكريم قوشــەیری، شــێوازێکی بــۆ وەرگرتنــی حەقیقەتی نیهایی خستە ڕوو و پاشان دیکەی ئەسحابی گرووپی جەمـال بە باوەڕی نوێ ئەفلاتوونیەکان سەبارەت بە خوڵقاندن بەهرەیـان وەرگـرت و بە متمــانەی ئەوەوە، ئافرانــدنیان بە چەنــد قۆناغــدا ناســاند. ئەم ئیــدەیە هەرچەند مـاوەیەکی زۆر لە زەینـی سـۆفیەکاندا مـایەوە لەبەرئەوەی لەگەڵ بـاوەڕی ئەوان بە تاقـانەیی بوونـدا ڕێکـنەدەکەوت و بەرە بەرە فەرامـۆش کرا.

بە بـاوەڕی ئەســحابی جەمـال حەقیقەتـی نیهـایی شـتێک نییە بەدەر لە جەمــالی ســەرمەدی، جەمــالی ســەرمەدی بەپێـی زاتـی خـۆی بە شــوێن ئەوەوەیە کە روخساری خۆی لە ئاوێنەی جیهاندا ببینێت، جیهان، نیگار یان وێـنەی جەمــالی ســەرمەدیە، بەم شـێوەیە ئەســحابی گرووپـی جەمـال لە چەمکــی نــوێ ئەفلاتــوونی خوڵقانــدن دوورکەوتــنەوە کە جیهانیــان بە ســەرچاوەیەکی فەیـزی خـودا دەزانـی و وەک میـر سـید شـەریف عەلـی جورجـانی باوەڕیـان وەهـا بـوو کە دەرکەوتەی جـوانی هـۆی خوڵقانـدنە و عەشـق یەکەمـین خوڵقـاوە و عەشـقە کە جەمـالی سـەرمەدی دەردەخـات. سۆفیە ئێرانیەکان بەپێی بنەڕەتی زەردەشتی خۆی ئەم عەشقە جیهـانگیرە یان بە ئاگرێکی پیرۆز ناونا کە بێجگە لە خـوا، هەمـوو شـتێک دەسـوتێنێت. جلال الدینی بەڵخی وتوویەتی:

شاد باش ای عشق خوش سودای   ما ای طبیب جمله علتهای ما
ای دوای نخوت و ناموس ما   ای تو افلاطون و جالینوس ما

بە هۆی ئەم جیهان بینییەوە سەرخۆشبوونی سۆفیانە کە یەکەمینجار لە لایەن بایەزید بسطامیەوە هاتە ئاراوە و پاشان بووە خاڵی جیاکاریی ئەم گرووپە، ڕەنگە بتوانین هیندیەکان بە کاریگەر بزانین لە گەشەکردنی ئەم چەمکەدا، لەو سەردەمەدا هەر ساڵ خەڵکێکی زۆر لە هیندوەکان بە مەبەستی زیارەتی مەعبەدی بوودایی کە لە باکوودا دامەزرابوو و ئێستاش بەردەوامە، ئەوان دەهاتن بۆ ئێران و لەوەدەچێت کە فکرەکانی خۆیان گەیاندبێتە ئێرانیەکان، بە هاتنی حسین بن منصور حەلاج چەمکی تاکایەتی بوون زیاتر لە جاران لەم گرووپەدا دەیکرد. حسین بە ئایینی ودان تا خوازەکانی هیند هاواری کرد کە "من خوام" بە زمانی ودنا تا "اهم برهما اسمی" (Aham Brahma asmi)

لە ڕوانگەی سۆفیەکانی ئەم گرووپەدا حەقیقەتی نیهایی یان جوانی هەمیشەیی بێ کۆتاییە و لە سنوورەکانی سەرەتا و ئەنجام و ڕاست و چەپ و سەر و خوارەوە بە تەواوەتی ئازادە. لەم زاتە بێ کۆتاییەدا جەوهەر دەرکەوت بە تەواوەتی تاقانەیە، بوون ئاوێنەیەکە کە بوونی ڕەها تیشکدەداتەوە و بەپێی دەنگی عەزیز بن محمد نەسەفی ئاوێنە دوو جۆرە:

١. ئاوێنەیەک کە تەنها ڕوخساری دەرەوە دەنوێنێتەوە و ئاوەهایە سرووشت.

٢. ئاوێنەیەک کە زاتی حەقیقی دەنوێنێتەوە و ئاوەهایە مرۆڤ کە زاتی ڕەهایە و بە هەڵە خۆی بە بوونەوەرێکی سەربەخۆ دەزانێت.

نەسەفی لەم بارەوە دەڵێت: ئەی دەروێش! ئایا وا بیر دەکەویتەوە کە بوونی تۆ لە لە خوا سەربەخۆیە... وەها بیرکردنەوەیەک چاوپۆشی کردنێکی گەورەیە.

نەسەفی لەم بارەوە باس لە تەمسیلێکی جوان دەکات: چەند ماسیەک لە ناو ڕووبارێکدا دەژیان و هەرچەند لە ناو ئاودا دەجوڵان و دەژیان، بەڵام

ئاو واته بناغەی ژیانی خۆیان نەدەناسی، چوون بۆ لای ماسیەکی عاقڵتر و داوای نیشانەکانی ئاویان لێکرد، ماسی فەیلسووف ئاوەها وڵامی دایەوە:

ای در طلب گره گشایی مرده!    با وصل بزاده وز جدایی مرده!

ای بر لب بحر و تشنه در خاک شده وی بر سر گنج و از گدایی مرده!

کەواتە هەستی جیابوونەوە لە نەزانیەوەیە و نامۆیی سەر بە سەر نمودی هەیە خەوتووە؛ سێبەرە، نامۆیی پەیوەستە بە نیسبەتەوە و نیسبەتیش بە هۆی خود ناسی زاتی موتڵەقەوە بۆتە پێویستیەک. پێغەمبەری گەورەی ئەم گرووپە، جلال الدین بەڵخی یان رومی کە هێگێل پێی دەڵێ "رومی سەرتر" بە ئایینی نوێ ئەفلاتوونیەکان چەمکی رۆحی جیهانی باسکرد کە لە دەڤەرە جیاوازەکانی بووندا دەردەکەوێت و بە روانگەی رۆژگاری ئێمە ئەوەی نواندەوە و کردی بە یەکێک لە پارچە جوانەکانی مەسنەوی خۆی. ناوەرۆکی ئەم پارچەیە لە چیرۆکی خولقاندن دا بەرهەمی کلۆد، هاتووە و بە باوەڕی کلۆد روانینێکی رئالیستییە و لە نێوان گریمانەخوازی (جلال الدین)ەوە دەدرەوشێتەوە. ئەم باسە زۆر لە چەمکی ئێستای کامڵبوون دەچێت:

آمده اول به اقلیم جماد
وز جمادی در نباتی اوفتاد
سالها اندر نباتی عمر کرد
وز جمادی یاد ناورد از نبرد
وز نباتی چون به حیوانی فتاد
نامدش حال نباتی هیچ یاد
جز همین میلی که دارد سوی آن
خاصه در وقت بهار و ضیمران
همچو میل کودکان با مادران
سر میل خود نداند در لبان
همچو میل مفرط هر نو مرید

سوی آن پیر جوانبخت مجید
جزو عقل این از آن عقل کلست
جنبش این سایه زان شاخ گلست
سایه‌اش فانی شود آخر درو
پس بداند سر میل و جست و جو
سایهٔ شاخ دگر ای نیکبخت
کی بجنبد گر نجنبد این درخت
باز از حیوان سوی انسانیش
می‌کشید آن خالقی که دانیش
هم چنین اقلیم تا اقلیم رفت
تا شد اکنون عاقل و دانا و زفت
عقلهای اولینش یاد نیست
هم ازین عقلش تحول کردنیست

بەراوردکردنی ئیدەکانی ئەم دوو گرووپە لەگەڵ بنەماکانی فەلسەفەی نوێ ئەفلاتوونیدا کارێکی بەسوودە، لە سیستمی نوێ ئەفلاتوونیەکاندا چەمکی حلول رێگەی هەیە و هەروەها چەمکی ئیستعلا، خوا لەبەرئەوەی کە هۆی گشت شتەکانە لە هەموو شوێنیکدا هەیە و لەبەرئەوەی بێجگە لە هەموو شتەکانە لە هیچ شوێنێکدا نییە، ئەگەر تەنها بڵێین کە خوا لە هەموو شوێنێکدا هەیە و وتەکەی خۆمان زیاتر نەکەین کە "لە هەمانکاتدا لە هیچ شوێنێکدا نییە" خوا دەبێتە هەموو شتێک. بە راستیش خودای گرووپی جەمال هەموو شتێکە، حەکیمی نوێ ئەفلاتوونی جیهانە ماددیەکانی خاوەنی جۆرێک سەقامگرتوویی یان دەوام دەزانی، بەڵام گرووپی جەمال تاقیکردنەوە هەستییەکانیان بە جۆرێک خەون دەزانی و دەیانوت کە ژیانی بەرتەسکی هەست وەک خەون وایە و مەرگ پەیامهێنەری هەستانە، جیاوازی گەورەی ئەم دوو ئایینە لە باسەکانی خلوود دا دەردەکەوێت. هەوەک ویتاکر ئاماژەی پێدەدا خلوود بێ دارشتن لە بنەڕەتەوە چەمکێکی

رۆژهەڵاتییە و حەکیمە ئیسلامیەکان بە دارشتنی تیۆری مانەوەی رۆح بێ کەسایەتی مرۆیی لە ئەرەستۆییەکان و نوێ ئەفلاتوونیەکان جیا کرانەوە.

لەو بابەتانەوە کە سەبارەت بە جەمال خوازەکان وترا دەتوانین ئاوەها باسەکە کۆبکەینەوە کە ئەندێشەی ئەوان لە سەر سێ بنەما راوەستاوە:

١. حەقیقەتی نیاهی بە ئامێری سەرتر لە هەستەکان دەناسرێت.

٢. حەقیقەتی نیهایی دیار نییە.

٣. حەقیقەتی نیهایی تاقانەیە.

هەندێ لە توێژەران لە بەرامبەر ئەم سێ بنەڕەتەدا پەرچە کرداریان نواند و ئیدەی دیکەیان هێنایە ئاراوە:

١. پەرچەکرادی (لا ادریان): گروپێک لە بیرمەندان لە بەرامبەر بنەرەتی یەکەمدا بەرەو نەناس بوونی حەقیقەت رۆیشتن. لەم ژمارەیە عومەری خەیام دەتوانین ناوبەرین کە لە سەدەی شەشی کۆچیدا لە بێ هیوایی فەلسەفی خۆیدا هاواری کرد:

آنها که کشته شراب نابندو   آنها که به شب مدام در محرابند

بر خشک یکی نیست، همه در آبند   بیدار یکی نیست، همه در خوابند

٢. پەرچە کرداری ئیماندارەکان: گروپێک لە خواناسەکان لە بەرامبەر بنەڕەتی دووهەمدا حەقیقەتی نیهاییان بە شتێکی نادیار زانی. تقی الدین ابوالعباس احمد تیمیە و پەیڕەوەکانی لە سەدەی هەفتەمی کۆچییدا پەیوەست بوو بەم گرووپە.

٣. پەرچەکرداری چەندخوازەکان: گرووپێک لە بیرمەندان بنەڕەتی سێهەم واتە تاقانەیی حەقیقەتیان خستە بەر گومان. نوێنەری ئەم بزووتنەوە واحد محمود بوو.

لە باری فەلسەفییەوە پەرچەکرداری سێهەم لەو دوو پەرچەکردارەی دیکە گرنگترە و لە کۆمەڵگەی تردا وێنەی هەیە، بەسەریەکەوە مێژووی فکری مرۆڤ بریتییە لەو یاسایانەی کە بۆ نەتەوەکانیتریش بە کەڵکدێت.

هەروەک چۆن سیستمە تاکخوازە ئەڵمانیەکان چەندخوازیی هێربارتیان هەژاند، هەموو خوایی ئێسپینۆزا فەلسەفەی لایب نیتسی پێکهێنا، خواپەرەستی ئیسلامیش گەیشتە چەندخوازیی واحد محمود. واحد محمود لە سەدەی هەفتەمی کۆچیدا واتە چەندین سەدە بەر لە لایب نیتس تاقانەییبوونی نەفی کرد و وەک لایب نیتس لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە جیهان کۆیەکە لە واحدەکان یان پاژە جیا نەکراوە ساکارەکان. ئەم واحدانە کە بە ناوی 'کەسەکان" دەناسرێت هەر لە سەرەتاوە بوون و خاوەنی ژیانن. کامڵبوونی ماددەی توخم یاسای گشتی جیهانە. هەر بۆیە واحدە ساکارەکانی جیهان بەپێی ئەو ماددانەی کە بەرەو لای خۆیانی رادەکێشن دەگۆڕدرێن و روخسارەکانی بوون بەردەوام باشتر دەکەن. واحد محمود سەبارەت بە خولقاندنی جیهانیش ئیدەیەکی هەیەو باس لەوە دەکات کە کامڵبوونی جیهان زەمەنێکی هەیە و ئەویش هەشت هەزار ساڵە، کاتێک هەشت دەورەی هەشت هەزار ساڵی بەسەر جیهاندا تێپەڕ بێت، جیهان لەناودەچێت و واحدەکانی لە یەکتر جیا دەبنەوە، بەڵام سەرلەنوێ واحدەکان لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە دەبن و جیهانێکی نوێ سازدەکرێتەوە. واحد محمود مەزهەبێکی پێکهێنا و ژمارەیەک پەیڕەوی پەیدا کرد، بەڵام زۆر ئازاردران و لە ئاکامدا لە لایەن شا عەباسی سەفەوی لەناوچوون. دەڵێن کە حافز شاعیری شیرازی باوەڕی بەم مەزهەبە بووە.

### گرووپی ئەسحابی نوور یان فکر

سێهەمین لایەن یان گرووپی تەسەوف لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە زاتی حەقیقەت نوور یان فکرە و دەبێ بە ئیشراق یان فکرەوە رێگەی تێبکرێت، ئەسحابی نوور بە پێچەوانەی ئەسحابی جەمال دەستیان لە ئایینی نوێ ئەفلاتوونی هەڵنەگرت، بەڵکو بە گۆڕانکاریی لەوەدا رێگەیان بۆ چەند سیستمی سۆفیانە کردەوە، لە باری فەلسەفیەوە دوو دەزگای گەورە لە باوەشی ئەم گرووپەدا پەروەردە کرا، یەکێک لەوانە دەزگایەکی ئێرانی بوو و ئەویدی کاریگەریەتی قورسی لە مەسیحیەتەوە وەرگرتبوو. سەرەڕای ئەمانە هەردوو سیستمەکە باوەڕیان وابوو کە بۆ روونکردنەوەی چەند لایەنی سرووشتی دەبێ لە زاتی حەقیقەتی نیهاییدا بنەڕەتێکی موناقەشە هەڵگر بدۆزرێتەوە. بەپێی مێژوو ئەم دووانە دەخەینە بەر توێژینەوە.

### گرووپی ئەسحابی نوور

بە هۆی پێوەندی ئیلاهیاتی ئیسلامی لەگەڵ شێوازەکانی جەدەلی یۆنانیەکان رۆحی رەخنەگری لە پانتای ئەندێشەی ئیسلامییدا دەرکەوت. یەکەمین روخساری ئەم رۆحە رەخنەگرە لە فکرەکانی ابو الحسن ئەشعەری و کامڵترینی لە بەرهەمەکانی ابو حامد محمد غەزالییدا دەبینین. لە نێوان هزرخوازە ئیعتیزالیەکانیشدا پیاوگەلێکی ورد وەک ابو اسحاق نظام سەریان هەڵدا و لە جیاتی پەیڕەوکردنی فەلسەفەی یۆنانی بە روانگەیەکی رەخنەگرانەوە سەیریان کرد. لایەنگرانی ئایین و هەروەها غەزالی و فخرالدین ڕازی و ابو البرکات بەغدادی و ابو الحسن عەلی ئامودی هێرشیان کردە سەر گشت ئەرکانی فەلسەفەی یۆنانی، هەروەها هەندێ کەس بە هۆی خوازە ئایینیەکانەوە لە نواندنەوەی لاوازیی لۆژیکی یۆنانییدا هەوڵیان دا وەک: ابو سعید حسن سیرافی، قاضی عبدالجبار، ابو

المعالی عبدالملک جوینی و ابو القاسم کعبی بلخی و بەتایبەت تقی الدین ابو العباس احمد تیمیە. گرووپێک لە زانا سۆفیەکانیش هاتنە ریزی رەخنەگرانی فەلسەفەی یۆنانی، هەروەک ابو حفص عمر سەهرەوەردی لە کتێبێکدا بە ناوی (رشف النصائح الایمانیە وکشف الفضائح الیونانیە) دا هەوڵی ئەوەی دا کە لێڵبوونی هزری رەها بسەلمێنێت. بە هۆی پەرچەکرداری ئەشعەریەکان لە بەرامبەر موعتەزیلەدا نە تەنها هەندێ چەمکی نوێ هاتنە ئاراوە بەڵکو زنجیرە پەرتووکاوەکانی هزرخوازیش سەرانسەر پچڕان.

ئەردمان Erdmann باسی لەوە کردووە کە فەلسەفەی ئیسلامی پاش فارابی و ئیبن سینا هەرەسی هێنا، هەربۆیە پێکهێنەری گومانخوازی و عیرفان بووە، ئەردمان ئەم خاڵەی لەبیر چووە کە موسوڵمانان بە رەخنەی فەلسەفی خۆیان لە لایەکەوە فەلسەفەی یۆنانیان رەتکردۆتەوە و لە لایەکیتریشەوە فەلسەفەی ئێرانیان سەرلەنوێ ساز کردۆتەوە. فەلسەفەی یۆنانی بە دەرکەوتنی سیستمێکی بە تەواوەتی ئێرانی بێ توانا بووە و لە بەرامبەر گوشاری ئەشعەریەکان و دیکەی جەزم بیرە ئیسلامیەکان بە تەواوەتی رووخا.

لە بەرەکەتی رزگاربوونی فکری موسوڵمانان شهاب الدین یحیی سەهرەوەردی کە کۆچکردووی ٥٨٧ یە، درەوشایەوە و هەوڵی دروستکردنی فەلسەفەیەکی نوێی دا. شهاب الدین بە تەواوەتی چەمکە دێرینەکانی فەرامۆش نەکرد، بەڵام بەپێی فکری رەسەنی ئێرانی خۆی بە پێچەوانەی هەڕەشەکانی کاربەدەستە بەغیلەکان بیری لە سەربەخۆیی کردەوە. لە فەلسەفەی ئەودا سونەتە فکریەکانی ئێرانی کەون ئارا کە تا رادەیەک لە ناو بەرهەمەکانی محەمەد زەکەریای ڕازی و ابو حامد غەزالی و ئیسماعیلیەکاندا دەرکەوتبوو، لەگەڵ فکری حەکیمەکان و ئیلاهیاتی ئیسلامییدا هەماهەنگ بوو. شهاب الدین سەهرەوەردی کە پاشان بە ناوی "شیخ اشراق مقتول" ناسرا لای مجدالدین جیلی مامۆستای فخرالدین رازی

دەرسی خوێند و هێشتا زۆر لاو بوو کە بووە پێشڕەوی گشت حەکیمەکانی جیهانی ئیسلام. ملک الظاهر کوڕی سوڵتان صلاح الدین ایوبی کە بە گەورەیی ستایشتی دەکرد ئەوی بانگهێشت کردە لای خۆی بۆ حەلەب. فەیلسووفی لاو لە حەلەبدا بیروباوەڕە سەربەخۆکانی خۆی نواندەوە. جەزم ئەندێشە خوێنمژەکان کە لە گشت هەرێمەکان و سەردەمەکاندا بۆ داپۆشینی بێ هێزی فکری خۆیان پەنایان بردۆتە بەر زوڵم و زۆر، ئێرەییان پێ برد و نامەیان بۆ سوڵتان صلاح الدین نووسی کە وانەکانی سەهرەوەردی ئیسلام دەخاتە مەترسیەوە و دەبێ سەرکووت بکرێت. سوڵتان داواکەی ئەوانی قبووڵ کرد، فەیلسووفی لاوی ئێرانی لە سی و شەش ساڵییدا بە هێمنی باوەشی بۆ مەرگ کردەوە، مەرگێک کە ئەوی خستە ریزی شەهیدانی حەقیقەت و ناوێکی جاویدانی پێ بەخشی. ئەمڕۆکە ئەو مرۆڤ کوژانە و چەندین مرۆڤ کوژی دیکە مردوون و رزیون، بەڵام فەلسەفەیەک کە بە نرخی گیانێک دروستکرا هەروەک خۆی زیندووە و زۆرێک لە حەقیقەتخوازەکان بەرەو لای خۆی رادەکێشێت.

سەهرەوەردی کەسایەتیەکی بەرجەستەی هەبوو، خاوەنی سەربەخۆیی فکری و هێزی بڕیاردان و داڕشتنی سیستەم بوو، لەوانەش سەرتر سەبارەت بە سونەتە ئێرانیەکان بە ئەمەک بوو، سەبارەت بە گرفتە گرنگە جیاوازەکان لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتووندا ڕووبەڕوو بووەوە و فەلسەفەی ئەرەستۆی بە پێشەکی سیستەمی فەلسەفی خۆی زانی و بە ئازادی رەخنەی لێگرت، هیچ بابەتێک نەبوو کە رەخنەی لێنەگرتبێت و تەنانەت لۆژیکی ئەرەستۆی خستە بەر لێکۆڵینەوەیەکی ورد و هەندێ لە بنەماکانی باتڵ کردەوە، بۆ وێنە ئەوەی راگەیاند کە لە لۆژیکی ئەرەستۆدا پێناسەی جنس و فصل دەکرێت لەحاڵێکدا کە فصل واتە تایبەتمەندی جیاکەرەوەی شتی پێناسەکراو، کە هەڵبەت ناکرێ بۆ شتێکیتری بەکار بەرین، ئەو بابەتە دەستنیشان کراوەمان پێ ناناسێنێت. کەسێک کە ئەسپی نەناسیبێت بە پێناسەیەکی لۆژیک لە ئەسپ واتە "ئاژەڵیک

که دەحیلێنێت" ناتوانێت ئەو بابەتە بناسێت، کەسێکی وەها، دیارە کە لە چەمکی ئاژەڵ تێدەگات، لەبەرئەوەی کە پێشتر زۆر ئاژەڵیتری دیوە کە سیفەتی ئاژەڵایەتییان هەیە. ئەم کەسە بەڵام لە چەمکی حیلاندن تێناگات لەبەرئەوەی کە لە هیچ خاڵێکدا بێجگە لە چەمکی وەهادا رووبەڕووی ئەم بابەتە نەبووەتەوە. کەواتە پێناسەی ئەرەستۆیی لە باری زانستییەوە بابەتێکی بە تەواوەتی بێهودەیە. سەهرەوەردی سەبارەت بە پێناسەی لۆژیک ئیدەیەکی هێناوەتە ئاراوە کە زۆر لە ئیدەی بۆزناکیوت Bosanquet دەچێت. بۆزانکیوت پێناسە بە "کۆکردنەوەی چییەتیەکان" دەزانێت و سەهرەوەردی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لە پێناسەی دروستدا دەبێ گشت سیفەتە زاتیەکانی شتەکە باس بکرێت و مەبەست لە وەسفە زاتیەکانی شت ئەوانەن کە هەرچەند پێدەچێت بە تاک لە شتە جیاوازەکاندا ببن بە کۆ لە هیچ شتێکدا بێجگە لە شتی باسکراو نادۆزرێنەوە.

بۆ ئەوەی ئاگاداری خزمەتکردنی سهروردی بین بە فەلسەفەی ئێران دەبێ فەلسەفەی ئولای ئەو بخەینە بەر باس. بە باوەڕی شیخ ئیشراق، کەسێک کە بیەوێت بچێتە ناخی فەلسەفەی ئەو، دەبێ بە باشی لەگەڵ فەلسەفەی ئەرەستۆیی و زانستی لۆژیک و ماتماتیک و تەسەوفدا ئاشنا بێت و زەینی خۆی لە چڵکی دەمارگرژی و تاوان بپاڵێوێت و بەم شێوە بەرەبەرە دەستی بگاتە زەوق یان هەستێکی دەروونی کە دەستکەوتە تیۆریەکانی عەقڵ هەڵدەسەنگێنێت و ئێدیتی دەکات. عەقڵی بێ یاوەر جێی متمانە نییە کەواتە دەبێ داوای یارمەتی لە زەوق بکات، واتە ئیدراکێکی پڕ لە نهێنی کە دەچێتە قووڵایی بابەتەکان و رۆحی بێ ئارام دەناسێت و ئارامی پێدەبەخشیت و شک بێ توانا دەکات. سەهرەوەردی لایەنە جیاوازەکانی راهێنانە زەوقیەکانی شیکردۆتەوە، ئێمە لەم بوارەدا ئاوڕ لە لایەنێک لەم تاقیکردنەوە دەدەینەوە کە بە هۆی فکری ئیستدلالیەوە رێکدەخرێت. کەواتە سێ لقەکەی حیکمەتی ئیشراق واتە بوونناسی و جیهانناسی و دەروونناسی دەخەینە بەرباس.

## ئەلف- بوونناسی

بنەڕەتـــی نیهـــایی بـــوون "نـــوری زاڵ"ە و پێویـــستی هەبـــوونی ڕۆشنکەرەوەی بەردەوامە، بە باوەڕی محمد شـەریف هەرەوی کە لەسـەر کتێبی (حکمە الاشـراق سـهروردی) لێدوانێکی نووسـیوە، باس لەوە دەکات کە هیچ شتێک دیارتر لە نور نییە و شیاوی دیتن پێویستی بە پێناسـەکردن نییە، دەرکەوتن لە زاتی نووردایە لەبەرئەوەی کە ئەگەر دەرکەوتن عـرض بێت و زیاد کرابێتە سەر ڕووناکی پێویست دەکات کە ڕوونـاکی لە نەفسی خۆیدا شیاوی دیتن نەبێت و خـۆی بە هـۆی شـتێکی تـر کە لە زاتـی خۆیدا دەبیندرێت، ببیندرێت. ئەمەش دیسان وا دەکات کە ڕوونـاکی نەبینـدرێت و هەر شتێک بێجگە لەوە شیاوی دیتن بێت و هەڵبەت وەها ئاکامێک پاسـاوی بۆ نـاهێنرێتەوە. کەواتە هـۆی بـوونی نـوور خـودی ئەوەیە، هەرچـی بێجگە لەوەیە بە ناچار بەندکراو و بەدی هاتووە. "لانـوور" یـان غسق شـتێک نییە کە لە سەرچاوەیەکی سەربەخۆوە هەڵقوڵا بێت و پەیڕەوەکانی ئـایینی مغـی کە نـوور و زوڵمەتیـان بە دوو حەقیقەتـی جیاکراوە و خـوڵقاوی دوو هـۆی داهێنەری سەربەخۆ زانیوە، تووشی هەڵە بوون. مۆبەدە زەردەشتیەکان بە ناوی ئەوەی کە "یەک" بێجگە لە یەک زیـاتر نابێت ڕوونـاکی و تاریکـایی لە دوو ســەرچاوەی ســەربەخۆ دەزانــن، بەڵام حەکیمەکــانی ئێرانــی باســتان لەگەڵ دووخوازیی ئەواندا هاوڕا نەبوون. لە ڕاستیدا بەرامبەر بوونی نوور و زوڵمەت بەرەو ڕووبوونەوەی جیاوازیی نییە، بەڵکو بەرامـبەر وەسـتانی بــوون و نەبــوونە، نــووری ســـەرەتایی ســـەرچاوەی هەر حەرەکەیەکە و مەبەسـت لە حەرەکەکـردن تەنهـا گـۆڕانی شـوێن نیـیە، نـوور لە بنەڕەتـدا عاشـقی تیـشک پرژانـدنە و ئەم عەشـقە وای لێدەکات کە بە تیـشکی خـۆی وزە و ژیان ببەخشێتە هەموو شتەکان، نـوور چەشـنی جۆراوجـۆری هەیە.

نووره پڕ شەوقەکان خۆیان پێکهێنەری نوورەکانیترن، بەڵام لە ئاکامدا دەرەجەی درەوشاوەیی نوور ئەوەندە کەم دەبێتەوە کە ئیتر ناتوانێت نووری نوێ پێکبهێنیت. ئەگەر بە زمانی تئۆلۆژی بدوێین دەڵێین کە ئەم نوورانە فریشتەگەلێکن کە بە بەرەکەتی نووری زاڵ گشت بوونەوەرەکان خاوەنی ژیان و هێز دەکەن. مەشائیەکان کە ژمارەی عەقڵە رەسەنەکانیان و ژمارەی مەقولاتی فکریان بە دە دەزانی تووشی هەڵە بوون، نووری زاڵ ئیمکانیاتێکی زۆری هەیە و جیهان بە گشت جۆرەکانیەوە تەنها روخسارێکی بچووکە لە زاتی بێ کۆتایی و هەربۆیە مەقولاتە کەمەکانی ئەرەستۆ متمانەی رەهای پێناکرێت، مرۆڤ توانای ئەوەی نییە کە بە ئەندێشە سنووردارەکەی خۆی بەسەر گشت مەقولاتەکاندا زاڵ ببێت. نووری زاڵ بەپێی مەقولاتێکی زاڵ بەسەر ئەو شتەدا کە نوور نییە، رووناکی دەپژێنن، دەکرێ دوو جۆرە نووری گرنگ بناسین:

**١. نووری تاك:**

ئەم نوورە کە بریتییە لە عەقڵی گشتی و عەقڵی ورد روخسارێک بەخۆوە ناگرێت و هەرگیز نابێتە موڵکی هیچ شتێک بێجگە لە خۆی. هەموو جۆرەکانی نوور واتە نووری تا رادەیەک ئاگا و نووری ئاگا و نووری خودئاگا لە باری تیشکەوە پێکەوە جیاوازیان هەیە و لە نووری تاک لە داک دەبن، نزیکایەتی و دووریی ئەوان لە نووری تاکە کە پلەی تیشکدانەوەیان دەستنیشان دەکات. نەفەس یان عەقڵی ورد بەشێکی تارمایی یان تیشکدانەوەی لاوازی نووری زاڵە. نووری زاڵ خۆی بە خۆی پێناسە دەکات و بێجگە لە خۆی پێویستی بە شتێک نییەکە ئەو بناسێت. زاتی نووری تاک ئاگایی یان خودناسیینە، بەڵام نەفی کردنی نوور واتە زوڵمەت وەها چییەتیەکی نییە.

**٠٢ نووری عارضی:**

ئەم نــووره دەتوانێــت تــایبەت بکرێــت بە شــتیک بــێجگە لەخــۆی و جەستەی پێ ببەخشێت. نووری ئەستێرەکان و هەروەها بیندراو بوونی دیکەی شتەکان لەم بابەتەن، نووری عارضی یان باشتر بڵێین نووری هەست پێکراو، تیشکدانەوەیەکی زۆر کزی نووری "قاهر"ە و بەهۆی لایەنێک کە لەگەڵ سەرچاوەکەی خۆیدا هەیەتی لە هێزی جەوهەری نووری تاک بێبەشە. هەروەک باسکرا هەر نوورێک لە لایەن خۆیەوە نوورێکی کز دەپرژێنێت و ئەم گەڕیانە هەروا درێژەی دەبێت و نوور لە سەربەخۆیی دادەبڕێت و بۆ مانەوەی خۆی پێویستی بە غەیر دەبێت. وەها نوورێک نووری عارضیە، لەم حاڵەتەدا پێوەندی نێوان نووری تاک و نووری عارضی پێوەندی نیوان هۆ و هۆکارە، هۆ بە تەواوەتی لە هۆکار دانەبڕاوە بەڵکو هەمان هۆکارە کە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە و بۆتە بابەتێکی لاوازتر، بەدەر لە نووری تاک هیچ شتێک و تەنانەت زاتی شتی رووناک ناتوانێت هۆکاری نووری عارضی بێت، نووری عارضی بەدیهاتوو و هەروەها دابڕاویشە و لە شتەکان جیا دەبێتەوە بێ ئەوەی کە لە ناخی ئەو شتانەدا گۆڕانکاریی بخوڵقێنێت، ئەگەر زاتی شتی رووناک هۆی نووری عارضی بێت جیابوونەوەی نوور لە شتی رووناک ئەستەم دەبێت لەبەرئەوەی کە بوونی هۆی ناچالاک وێنە ناکرێت.

سەهرەوەردی بوونی تاریکایی کە لە نکولی کردن لە نوورەوە دروست دەبێت و خۆی بابەتی نوورە، بە پێویستیی دەزانی، لەهەمان حاڵدا هاوڕای ئەشعەریەکان بوو کە دێوی سەرتری ئەرەستۆیی ئینکار دەکرد، هەروەها وەک ئەشعەریەکان گشت مەقولاتی دیکەی فکر بێجگە لە جەوهەر و چییەتی بە زیادە دەزانی. شێخی ئیشراق بە پاڵپشتی ناسینی مرۆیی، هەوڵی ساغکردنەوەی تیۆری ناسینی ئەشعەریەکانی دا و باسی لەوە کرد کە پەیوەندی ئێمە لەگەڵ بابەتی ناسیندا پەیوەندیەکی ناچالاک نییە، نەفسی

تـاک به هـۆی ئەوەی کە خـۆی نـووره لە گەڕیـانی ناسـیندا سـەبارەت بە بـابەتەکەی نـوور دەپرژێنێـت، لە روانـگەی سـەهرەوەردیەوە جیهـان واتە گەڕیـانێکی تاقـانەی چـالاک کە کـردەکەی نوورپرژانـدن یـان ئیـشراقە. ئەو نوورانەی کە ئێمە وەرمانگرتوون تەنها بەشێکن لە نووری قاهیر و نووری قاهیریش بەپێی ئەو یاسایانەی کە بۆ ئێمە ئاشکرا نییە دەرکەوتەی دیکەی پەیدا کردووە، لە هەمانکاتدا کە عەقڵی ئێمە هـاوڕای مەقولاتێکی بەرتەسک چالاکی دەکات دەبێ مەقولاتی جیهان لە رادەبەدەر بزانین، بەم شێوە دەبێ قبـوڵ بکەیـن کە سـەهرەوەردی بە جەختکـردن لەسـەر رێژەیـی بـوونی زانستی مرۆیی لە سیستەمی مرۆڤخوازی Humanism هـاوچەرخ نزیک دەبێتەوە.

**ب- جیهانناسیی**

شهاب الدین سـەهرەوەردی لانـوور یـان غسق بە چەنـدایەتی رەهـا یـان مـاددەی رەهـا دەزانێت، مـاددە یـان چەندایەتی رەهـا بە پێچەوانەی دەنگی هەڵەی مەشائیەکان بابەتێکی سـەربەخۆ نییە، بەڵکو لایەنێکە لە لایەنەکانی نـوور، ئـێمە لەوێـوە حـوکم دەدەیـن لەسـەر هەبـوونی مـاددەی رەهـا کە لە بـواری ئەزموونـدا شـایەتی گـۆڕانی تـوخمە سـەرەتاییەکانین بە یەکتـر. مـاددەی رەهـا کە لە بـاری سـافی یـان پـاڵافتەییەوە پلەی جیـاوازی هەیە، دەڤەرە جیاوازەکانی ماددی پێکدەهێنێت، بە گشتی ماددەی رەهای شـتەکان لە دوو بەهرە پێکهاتووە:

١. ئەو شـتەی کە ئەوپەڕی شـوێنە و ئەو بەشـە جیـانەکراوانەی کە جەوهەرێکی لێڵە و لە سیستمی ئەشعەرییدا "چیەتیەکان" ی ناو لێنراوە.

٢. ئەوەی کە بەپێی پێویست لە شوێندایە و ئەو روخسارانەی تاریکاییە وەک کێش و بۆن و تام.

لە پەیوەندی ئەم دووانە ماددەی رەها تووشی تەریک بوون دەبێت. هەر شتێکی ماددی ئاوێتەیەکە لە روخسارەکانی تاریکایی و جەوهەری لێڵ و بە هۆی نووری تاک رووناک یان شیاوی دیتن کراوە. ئایا هۆکاری روخسارە جیاوازەکانی تاریکایی چییە؟ روخسارەکانی تاریکایی وەک روخسارەکانی نوور هۆی نووری تاقانەن کە بەتیشکدانەوە پەیتاپەیتاکانی خۆی دەبێتە هۆی زۆربوونی دەڤەرە جیاوازەکان. روخسارەکان کە هۆی جیاکردنەوەی شتەکانن لە یەکتر لە زاتی ماددەی رەهادا نیشتەجێ نەبوون. ئەگەر ماددەی رەها کە هەمان چییەتی رەهایە رەخسارەکانی لەخۆدەگرت، پێویست دەبوو کە هەموو شتەکان لەباری روخسارەکانی تاریکاییدا وەک یەکتر بن، ئەمەش لەگەڵ ئەزموونەکانی ژیانی ئێمەدا یەک ناگرێت، کەواتە بێگومان هۆی روخسارەکانی زوڵمەت ماددەی رەها نییە.

ئاکامی ئەو شتانەی کە باسکرا ئاوەهایە کە جەستە بە تەواوەتی وابەستەی نووری قاهرە و گشت جیهانیش هەر بەم شێوەیە، جیهان بریتییە لە بازنە یەک لە دوای یەکەکان، ئەو بازنانەی کە لە سەرچاوەی نوور نزیکترن، زیاتر لەوانەی کە دوورترن کەڵک لە نوور وەردەگرن، نوورە بێ ئەژمارە ناوەندیەکان نوور دەپژێننە ئەم بازنانە و هەموو پەراوێزەکانیان. نوورە ناوەندیەکان بڕێجار بە یارمەتی نووری ئاگا و بڕێجار بێ یارمەتی ئەوانە بە گشت چەشنەکانی بوون وزە دەبەخشن. مرۆڤ و ئاژەڵ و گیا بە بەرەکەتی نووری ئاگا و هەروەها شتەکان و توخمە ساکارەکان بێ ئەوە، وەدی دێن. لەم حاڵەتەدا ئەو ئاوێنە باڵا نوێنەی زۆرینە کە ئێمە بە جیهان ناوی دەبەین، سێبەرێکە لە تیشکە راستەوخۆکان و ناڕاستەوخۆکانی نووری قاهیر. هەر شتێک بەهرەیەکی لە نوور هەیە، بەڵام بە هیوای ئەوەی کە سەرریژ بێت لە رووناکی، عاشقانە بەرەو کانیاوی رەسەنی نوور هەوڵدەدات. بەراستی کە جیهان هیچ نییە بێجگە لە نمایشتی هەمیشەیی عەشق.

بوونەوەرەکانی جیهان لە چەند دەڤەر یان ئاستی بووندان:

**دەڤەری نووری قاهیر:**

١- دەڤەری عەقڵ یان بنەڕەتی ئەفلاک.

٢- دەڤەری نەفسەکان.

٣- دەڤەری روخسارەکان:

**ئەلف**- دەڤەری روخسارە مثلیەکان وەک دەڤەری ئەفلاک.

ب- دەڤەری روخسارە ماددیەکان: دەڤەری توخمەکان کە خۆی دەبێتە:

توخمە ساکارەکان وەک جیهانی جەماد و جیهانی گیا و ڕووەکەکان و جیهانی ئاژەڵەکان. توخمە پێکهاتەکان: جیهانی جەمادی و جیهانی رووەک و جیهانی ئاژەڵ. بۆ لێکدانەوەی ئەم باسە کۆکراوەی کە وترا، دەبێ ئاماژە بدەین کە لەناو جیهاندا هەرچی بێجگە لە نوور هەبێت لە دوو بەشدا کۆدەکرێتەوە:

١- بوونەوەرە قەدیمەکان وەک عەقڵ و رۆح و ئەفلاک و توخمە ساکارەکان و زەمەن و حەرەکە.

٢- بوونەوەرە پێکهاتەکان وەک بوونەوەرە کۆکراوەکان لە توخمەکان.

رۆحی فەلەکەکان بەهۆی حەزێکەوە کە بۆ وەرگرتنی نوورەکانی سەرچاوەی خۆیان هەیانە بەردەوام لە حەرەکەدان. حەرەکەی ئەفلاک کە دەگاتە دەرکەوتنی بەردەوامی جیهان، بابەتێکی قەدیمە. ماددەی ئەفلاک بە پێچەوانەی ماددە پڕ لە خەوشەکانی زوڵمەت رەهایە لە فیعل و کردەوە کیمیاییەکان. هەر فەلەکێک ماددەیەکی تایبەتی هەیە و لە رەوتێکی تایبەت بەخۆیدا دەجولێت. جیاوازی رەوتی ئەفلاک بەم هۆیەوەیە کە هەرکام لەوانە لە دوی مەعشوق یان نوورێکی تایبەتدایە. حەرەکە لایەنێکی زەمانە، سیلسیلەیەکە لە توخمەکانی زەمان کە دەرکەوتەیەکی دەرەکییان پەیدا کردووە. رابردوو، ئێستا و داهاتوو لە زاتی زەماندا بوونیان نییە و تەنها بە هۆی بەرژەوەندییە مرۆییەکانەوە هاتوونەتە ئاراوە. زەمان بێ سەرەتایە و سەرەتایەک کە بۆی دابین دەکەین خۆی خاڵێکە لە زەمان.

کەواتە دەبێ زەمان و حەرەکە بە قەدیم بزانین. توخمە سەرەتاییەکانی جیهان لە سێ زیاتر نین: ئاو، خاک و با. ئاگر بە توخمێکی سەربەخۆ نازانرێت، لەبەرئەوەی کە با، هەلگیرسێنەرە. توخمە ساکارەکان بە هۆی دزەکردنی هۆ فەلەکیەکان لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە دەبن و روخسارە نوێکان، سیلان و دخانیات و صلبیت پێکدەهێنن. لە گۆڕانکاریی توخمە سەرەتاییەکان گەڕیانی بوون و گەندەڵی روو دەدات و لە سەرانسەری دەڤەری زوڵمەتدا دەگەڕێت. بە هۆی بوون و گەندەڵیەوەیە کە روخسارەکانی بوون بەردەوام سەرتر دەبن و لە هێزەکانی نووربەخش نزیکتر دەبنەوە. گشت نمودەکانی سرووشت وەک باران و هەور و بروسکە و بەردی ئاسمانی لە حەرەکەی زاتی جیهانەوە دەبن و لەگەڵ چالاکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی نووری قاهیردا دەردەکەون. نووری قاهیر کاریگەریەتی هاوسان لەسەر شتەکان دانانێت لەبەرئەوەی کە شتەکان لە باری نوور وەرگرتنەوە پێکەوە یەکسان نین. بە کورتی دەکرێ بوترێت کە جیهان حەز یان عەشقێکە بە نیسبەت نوورەوە، حەز یان عەشقێک کە دەرکەوتەی دەرەکی پەیدا کردووە.

ئایا جیهان قەدیمە؟ جیهان لەبەرئەوەی کە دەرکەوتەی نووری قاهیرە بەستراو و پەیوەندیدارە و قەدیم نییە، بەڵام لەبەرئەوەی کە تیشکەکانی نووری سەرچاوەیە، قەدیمە. هەندێک لە نوورەکان راستەوخۆ لە نووری قاهیرەوە سەرچاوە دەگرن و بە پێی پێویست قەدیمن، بەڵام هەندێ لە نوورەکانی تر لە ئاوێتەبوونی ئەوانیتر پێکدێن و هەربۆیە بە پێچەوانەی نوورە رەسەنەکان راستەوخۆ لەگەڵ زاتی نووری قاهیردا پەیوەست نین و هەربۆیە قەدیم نین، بۆ وێنە کاتێک کە شتێکی رووناک لە بەرامبەر شتێکی تاریکدا دادەنرێت، رووناکی شتە رووناکەکە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی رەنگی شتە تاریکەکە و هەربۆیە رەنگ لە بەرامبەر نووردا بابەتێکی روودراوە. گشت نوورەکان یان شتەکان لە هەمانکاتدا کە دەرکەوتەی نووری قاهیرن،

بەدیهاتووشـن لەبەرئەوەی بە هـۆیەک لە هۆکـان لە زاتـی قەدیمـی نـووری قـاهیرەوە دێـن، کەسـانێک هەن کە بە ئیعتبـاری پێکهـاتەبوونی شـتەکانی دەورپـشتی خۆیـان گـشت جیهـان بە پێکهـاتەیەک دەزانـن. بـابەتی ئەوان لەکاتێکدا دروستە کە ئیستقرائی گشتی دروسـت بێت و لە ئاکامدا بتوانین قیاسی ئەوە بکەیـن کە بـۆ وێنە لەبەرئەوەی کە یەک بەیەکی حەبەشـیەکان رەشـن کەواتە گـشت حەبەشـیەکان رەشـن، یـان لەبەرئەوەی کە هەمـوو حەرەکەکـان سـەرەتایەکی زەمانیـان هەیە کەواتە هەمـوو حەرەکەکـان هەر بەم شـێوەیەن، وەهـا هۆهینـانەوەیەک پێویستی بە پەرەپێدانە، لەبەرئەوەی کە کـۆکردنەوەی گـشت حەبەشـیەکان لە رابـردوو، ئێـستا و داهـاتوو لەیەککاتدا ئەستەمە بنەڕەتی ئەم ئیستدلالە هەڵەیە و حوکمکردن نە خراپە و نە چـاک. لە ژمـاردنی هەمـوو کەسـە حەبەشـیەکان و هەڵسەنگاندنی ئەو حەرەکانەی کە لە دەڤەری ئەزموونەکانی ئێمەدا دەگونجێت هەرگیز ناگەینە ئەم ئەنجـامە کە "گـشت" حەبەشـیەکان رەشـن و هەمـوو حەرەکەکـان سەرەتایەکی زەمانیان هەیە.

**ب- دەروونناسی**

سـەبارەت بەو بـوونەوەرانەی کە سـەر بە پـلە خوارەوەکـانی بـوونن، حەرەکە و نوور پێکەوە هاوسـانیان نییە، بـۆ وێنە لەتە بەردێک هەرچەند خـاوەنی نـوورە و شـیاویی دیتـنە، بەڵام ناتوانێت بەشـێوازێکی خۆویـست بجـوڵێتەوە، بەهەر رادەیەک لە پەیـژەی بوونـدا، بەرەو پلەیەکـی سـەرتر بـڕۆیین بـوونەوەرە بەرزەکـان یـان گیانلەبەرەکـان دەبینـین کە حەرەکە و نووریان لە زاتی خۆیاندا هەماهەنگ کردووە و لە ئاکامـدا دەگەینە مـرۆڤ کە خاوەنی سەرترین کانوونی نووری تاقانەیە.

ئێستا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا ئەو نـوورە تـاکە تەنهایەی کە ناوی نەفسی مرۆییە بەر لەوەی کە جەستەی پێک بێت، هەبووە یان نا؟

داڕێژەری فەلسەفەی ئیشراق لەم بورادەدا ڕێگەی ئیبنی سینای گرتەبەر و باسی لەوە کرد کە نووره تاکە تەنهاکان پێشتر بوونیان نەبووە. ناکرێ مەقوولاتە مادديەکانی "یەک" و "زۆر" لەبارەی نووری تاقانەوە بەکاربەرین. نووری تاقانە لە زاتی خۆیدا نە یەکە و نە زۆر و تەنها بە هۆی نوور وەرگرتن لە ماددەکان دەچێتە روخسارگەلی جیاوازەوە. لە نێوان جەستە و نووری تاک یان نەفسدا پێوەندی هەیە، بەڵام ئەم پەیوەندیە پەیوەندیەکی هۆدار نییە، عەشقە کە ئەم دووانە پێکەوە گرێ دەداتەوە، جەستە حەز بە نوور دەکات، بەڵام بەپێی زاتی خۆی توانای ئەوەی نییە کە راستەوخۆ پێوەندی بگرێت بە سەرچاوەی نوورەوە کەواتە ناچار بۆ گەیشتن بە نوور، پێوەند دەدرێتەوە بە نەفس، نەفسیش ناتوانێت ئەو نوورەی کە راستەوخۆ لە سەرچاوەی گرتووە ببەخشێت بە شتی جامدی تاریک، لەبەرئەوەی کە کەرەستە لە باری دەرکەوتەکانیەوە جەمسەری پێچەوانەی نەفسە. بۆ پەیوەندی نێوان ئەم دووانە بوونێکی ناوبژیوان کە بتوانێت نوور و تاریکایی کۆبکاتەوە پێویستیەکی حاشاهەڵنگرە. ئەم ناوبژیوانە نەفسی حەیوانیە و ئەوەش هەڵمێکی گەرم و نەرم و نیان و شەفافە کە لە بنەڕەتدا لە شوێنی چەپی دڵدا جێگیرە، بەڵام لە هەموو ئەندامەکانی جەستەدا هاتووچۆ دەکات. نەفسی ئاژەڵی پەیوەندیەکی لاوازی هەیە لەگەڵ نووردا و هەربۆیە ئاژەڵەکانی سەر زەوی لە شەوە تاریکەکاندا بەرەو ئاگری بەتین هەڵدێن، بوونەوەرە ئاویەکانیش بۆ بەهرەوەرگرتن لە دیمەنی جوانی مانگ دەگەنە سەر ئاو، ئامانجی مرۆڤ عروج لە قادرمەی بوون و بەدەستهێنانی نووری زیاترە، ئەگەر ئەم عروجە درێژەی هەبێت، مرۆڤ لە کۆتاییدا لە دنیای روخسارەکان بە تەواوەتی رزگاری دەبێت، ئەم ئامانجە لە چ ڕێگەیەکەوە وەدی دێت؟ لە ڕێگەی ناسین و کردەوە، مرۆڤ دەتوانێت بە گۆڕانکاریی تێگەیشتن و ئیرادەی خۆی بە بیرکردنەوە و کردەوە بەرزترین ئامانجە مرۆییەکان بەدەست بهێنێت، کەواتە دەکرێ خوازیاری

کەمال ئاوەها ئامۆژگاری بکرێت کە بیروباوەری خۆت سەبارەت بە جیهان بگـۆڕە و بەپێـی ئەم گۆڕانکـارییە رەفتـار بـکە. پێویـست دەکـات کە هۆدوولایەنەکانی کەمال خواستن لێکبدەینەوە.

**١- ناسـین:** نـووری تاقـانە کـاتێ پەیوەنـد دەدرێـت بە بـوونەوەرێکی پـایەبەرزەوە لە جەمـسەری هێزەکـانی نـوور و تاریکـایی چەنـد هێزێـک دەردەکەوێت و کاملبوونی بوونەوەرەکان مسۆگەر دەکات، هێزەکانی نوور پێکهێـنەری پێـنج هەسـتی دەرەکـی و پێـنج هەسـتی نـاوەکی واتە هەسـتی هـاوبەش، تـرس، بینـایی، زاکیـرە و دابینکـردن دەبـن و هێزەکـانی تاریکـایی دروسـتکەری خـواردن و گەشـەکردنن. دەبـێ بـزانین کە جیاکردنەوەی ئەم هێزانە لە یەکتر لەبەر ئاسانکردنی باسەکەیە ئەگەرنا، هەر هێزێک دەتوانێت سـەرچاوەی گشت کردەوەکـان بێت. لە نـاو مێشکدا هێزێکـی تـاک بـوونی هەیە، بەڵام ئەم هێـزە بە بـۆنەی جیـاوازەوە نـاوی زۆرو جیـاوازی لەخۆگرتووە، زەین بـابەتێکی تاقـانەیەو تەنهـا بۆ ئاسـانکردنی تێگەیشتن و تێگەیانـدنە، بە هەمـوو ئەم باسـانەوە بە بـاوەڕی سـەهرەوەردی هێـزی نـاوەکی مێـشک جیـایە لە نـوورێکی تاقـانە کە نـاخی زاتـی مـرۆڤە. سەهرەوەردی بە رەواڵەت دیارە کە بەم شێوەیە لە نێوان مێشکی چالاک و نەفسدا کە لە بنەڕەتدا ناچالاکە، جیاوازی دادەنێت و جەختی لەسـەر ئەوە کردەوە کە گشت هێزەکانی زەیـن بە شـێوەیەکی سیحراویی لەگەڵ نەفسدا پێوەندیان هەیە.

سەهرەوەردی لە دەروناسییدا چەندین ئیدە و درکی داهێنەرانەی باس کردووە، درەوشـاوەترین باسـی ئەو سـەبارەت بە بـابەتی "ابصار"ە. بەپێی ئەم باسە لە کاتی دیتندا هـیچ تیشکێک لە چـاوەوە هەڵناستیت لەبەرئەوەی کە ئەگەر تیشکێک لە چاوی بینەرەوە هەستێت و بەرەو شتیبابەت بڕوات، وەهـا تیشکێک یـان جەوهەر دەبێت یـان عـرض. ئەم تیشکە ئەگەر عـرض بێـت ئەوە توانـایی ئەوەی نییە کە لە جەوهەرێـکەوە واتە چـاو بـڕوات بـۆ

جەوهەرێکی تر، واتە کەرەستەی بیندراو. ئەگەر جەوهەر بێت حەرەکەی ئەوە یان بە حوکمی شعورە یان بە حوکمی زاتی ئەوە. ئەگەر حەرەکەی تیشکی چاو بەپێی شعور بێت لەوکاتەدا تیشک وەک بوونەوەرێک دەبێت کە بوونەوەرەکانی دیکە درک دەکات. لەم بابەتەش ئەوە دیارە کە درکی مرۆیی کردەوەی مرۆڤ نەبێت بەڵکو کردەوەی تیشکی چاو بێت. لە دەروونناسی سەهرەوەردییدا ناسین بەدەر لە هەست و عەقڵ سەرچاوەیەکی تریشی هەیە و ئەویش زەوق یان درکی ناوەکییە کە لە جیهانی بێ شوێن و بێ زەمانی بوون تێدەگات. بۆ پەروەردەکردنی ئەم هۆ سیحراوییە کە هەڵەکانی ئاکامەکانی کاری عەقڵ ساغ دەکاتەوە و هەماهەنگی دەکات، دەبێ لە لایەکەوە فەلسەفە موتالاّ بکەین و بەوردی چەمکەکان لێکبدەینەوە و لە لایەکیتریشەوە بە فەزیلەتەوە هەڵسوکەوت بکەین.

**٢- کردەوە:**

مرۆڤ بوونەوەرێکی خاوەن کردەوەیە و هێزە پاڵنەرەکانی ئەمانەن:

**ئەلف-** عەقڵ یان نەفسی مولکی کە سەرچاوەی هۆشیاری و لێکدانەوە و خۆشویستنی زانستە.

**ب-** نەفسی نزم پلە کە سەرچاوەی رق و جەسارەت و سوڵتەخوازی و تەماحە.

**پ-** نەفسی حەیوانی کە سەرچاوەی چێژبردن و برسیەتی و حەزی جنسییە.

نەفسی مولکی، ئێمە بەرەو زانابوون دەبات و نەفسی نزم پلە و نەفسی حەیوانی ئەگەر بە هۆی هزرەوە رێکبخرێن دەبنە هۆی ژێدەری فەزیلەتی ئازایەتی و فەزیلەتی عیفەت و لە هەماهەنگی ئەم سێ نەفسە، فەزیلەتێکی تر ساز دەبێت کە ناوی عەدالەتە، فەزیلەتەکان هۆی پێشکەوتنی رۆحن و

لەبەرئەوەی کە گەشەی رۆح بۆ مرۆڤ مسۆگەرە دەبێ بوترێت کە ئەم دنیایە باشترین دنیای ئیمکانە، کەرەستەکان لە زاتی خۆیاندا باش یان خراپ نین. ئەگەر بەشێوەیەکی خراپ کەڵک لە شتەکان وەربگرین یان لە روانگەیەکی بەرتەسکەوە سەیریان بکەین دەگەینە چاکە و خراپە، بەڵام لە هەمانکاتیشدا ناکرێ نکوڵی لە واقیعی شەڕ واتە خراپە بکەین، شەڕ بوونی هەیە و لەگەڵ خێر واتە چاکەدا یەکسان نییە، خراپە تایبەتە بە یەکێک لە قۆناغەکانی جیهانی زوڵمەت و جیهانەکانی دیکە لێی بێبەشن. ئەو شەکاکانەی کە خراپە تایبەت دەکەن بە داهێنەرایەتی خوا، کردەوەی مرۆیی هاوشێوەی کردەوەی خوایی دادەنێن و بە هۆی وەها هەڵەیەک گشت بوونەوەرەکان لە هێزی ئیختیار بێبەش دەکەن. هەندێ لە کردەوە مرۆییەکان لەدایکبووی خراپەن، بەڵام کردەوەی خوایی سەرچاوەی خراپە نییە.

نەفس دەتوانێت بە پەیوەندی مەعریفە و فەزیلەت لە جیهانی زوڵمەت رزگاری بێت، هەرچی زیاتر لە زاتی شتەکان تێبگەین، زیاتر نزیک دەبینەوە لە عالەمی نوور و زیاتر بەرەولای دەڕۆین، هەروەک چۆن پلەکانی عەشق بێ ئەژمارن هەروا کامڵبوونی رۆحانیش قۆناغی زۆری هەیە، بەڵام لەنێوانیاندا پێنج قۆناغ گرنگایەتی زیاتری هەیە؛

١- قۆناغی من. لەم قۆناغەدا هەستکردن بە کەسایەتی زۆر بەهێزە و کردەوەی مرۆیی لە خۆپەرەستییەوە سەرچاوە دەگرێت.

٢- قۆناغی تۆ نەبوون. لەم قۆناغەدا کەسەکە خوازیاری قوڵایی نەفسی خۆی دەبێت و یەکسەرە لە هەموو شتە دەرەکیەکان روو هەڵدەگەڕێنێتەوە.

٣- قۆناغی من نیم. ئەم قۆناغە درێژەی پێویستی قۆناغی پێشووە.

٤- قۆناغی تۆ هەیت، لەم قۆناغەدا نەفیکردنی رەهای "من" و سەلماندنی "تۆ" کە لە حوکمی جێبەجیکردنی کامڵی ئیرادەی خوایە، وەدی دێت.

٥. قۆناغی من نیم و تۆ هەیت، لەم قۆناغەدا هەردوو ئاستی فکر بە تەواوەتی نەفی دەبن و حاڵەتی "ئاگایی ئاسمانی" دێتە ئەنجام.

نەفس لە هەرکام لە قۆناغە پێنج لایەنەکان بەهرە وەردەگرێت لە نوورگەلێکی توند کە لەگەڵ هەندێ دەنگی وادا ئاوێتەن کە وەسف ناکرێت. رەوتی کامڵبوونی نەفس بە مردن کۆتایی پێ نایەت، نەفسی تاک پاش مردن لەگەڵ نەفسەکانی دیکەدا یەک ناگرێت، بەڵکو هەر نەفسێک بەپێی نوورێک کە لە عالەمی جەستەدا وەریگرتووە، گەشە دەکات و دەڕواتە پێشەوە. شێخی ئیشراق باسی لەوە کردووە کە هیچ نەفسێک وەک نەفسەکەی تر نییە و بەم شێوەیە چەمکی "یەکگرتنی پاژە لێک جیانەکراوەکان"ی لایب نیتسی پێشبینی کرد.

کاتێ ئیمکانیاتی جەستە کۆتایی پێدێت، نەفس بۆ ئەوەی کە لە نوور وەرگرتن بەتاڵ نەبێت، پێدەچێت کە لەگەڵ جەستە یان دەزگایەکی جەستەیی دیکەدا کە لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی پێشوویدا یەک بگرێت، پەیوەندی ساز دەکات و دەڕوات بۆ دەڤەرە باڵاکانی بوون. لەهەر دەڤەرێکدا روخسارێکی تایبەت بەخۆوە دەگرێت و لە ئاکامدا دەگاتە شوێنی باڵاترین واتە حاڵەتی نەفی رەها، لەوەدەچێت کە هەندێ لە نەفسەکان بۆ قەرەبووکردنەوەی کەموکوڕییەکانی خۆیان بگەڕێنەوە بۆ ئەم دنیایە. سەهرەوەردی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە ئایینی دۆنادۆنی شیمانەیەکی راستە سەبارەت بە چارەنووسی نەفس و ناکرێ ئەوە بە لۆژیک پەسەند بکرێت یان رەفز بکرێتەوە. لە هەر حاڵەتێکدا کاتێک کە گەڕیانی نەفسەکان کۆتایی پێبێت و نەفسەکان بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوەی هاوبەشی خۆیان، نووری قاهیر پاڵ بە جیهانەوە دەنێت و سەردەمێکی نوێی بوون دەستپێدەکات. کەواتە رووداوگەلێک کە لە هەر بارێکەوە، دووپاتبوونەوەی مێژووی سەردەمە پێشووەکان دەبێت، سەرهەڵدەدات.

ئاوەهایە فەلسەفەی شەهیدی گەورەی ئێرانی، بە راستی ئەو یەکەمین داڕێژەر مێژووی فەلسەفەی ئێران بوو کە حەقیقەتی هەموو شێوەکانی فکری ئێرانی ناسی و بە کارامەییەوە ئاوێتەی کردن و سیستمێکی نوێی

داڕشت. خوای بە کۆی جیهانگەلی هەستکردن و وێنە و شیمانەکردن زانی و هەربۆیە هاتە فەلسەفەی تاکبوونەوە، بە پێچەوانەی هەندێ لە سۆفیەکانی بەر لە خۆی جیهانی بە حەقیقەت و نەفسی مرۆڤی بە خاوەنی تاکایەتیەکی جیاکراوە زانی. لە بواری هۆی نیهایی بووندا لەگەڵ حەکیمە شەریعەکاندا رێک کەوتبوو و باسی لەوە کرد کە هۆی نیهایی هەر بوونێک، نووری تاکە و جیهان سەرانسەر ئیشراقی نووری تاکە. لە دەروونناسیدا پەیڕەوی ئیبنو سینا بوو، بەڵام هی ئەو لە دەروونناسیی ئیبنو سینا رێکتر بوو و زیاتر لەو بەرەو ئەزموونکردن رۆیشت.

لە بواری فەلسەفی ئەخلاقدا بە رێگەی ئەرەستۆدا رۆیشت و چەمکی "نێوان هەڵبژاردن"ی ئەوی بە وردبینیەکی تەواو لێکدایەوە. لەوانەش سەرتر، بە گۆڕانکاریی لە ئایینی نوێ ئەفلاتوونی پێشین، سیستمێکی فکری تایبەتی داڕشت کە لە لایەکەوە بەرەو فەلسەفەی ئەفلاتوون رۆی و لە لایەکیترەوە دووالیزم کەونی ئێرانی هێنایە ئاراوە و روخسارێکی رۆحانی پێبەخشی. هیچ کام لەو بیرمەندانەی لە ئێرانەوە هاتوون نەیانتوانیوە وەک ئەو بە چەند بنەمای بنەڕەتی هەموو لایەنەکانی بوون لێکبدەنەوە. سەهرەوەردی لە سەرانسەری دەزگای فکری خۆیدا رووی کردە ئەزموون خوازیی و هەوڵیدا کە هەموو شتەکان و تەنانەت نمووده جەستەیەکانیش بە تیۆری ئیشراقی خۆی بنوێنێتەوە. عەینیەتی جیهان کە لە هەمە خوایی توندڕەوانە و زەینی خەڵکانی پێشوودا بزر و سواو بووبوو، لە دەزگای سەهرەوەردییدا متمانەیەکی شایستەی پەیدا کرد و کەوتە بەر لێکدانەوە و تێبینی ورد.

ئەم بیرمەندە زیرەکە لە سەرانسەری سیستمی فکری خۆیدا هەماهەنگیەکی کامڵی لە نێوان هزر و سۆزدا دامەزراند و هەربۆیە زیاتر لە بیرمەندەکانی دیکە توانی زەینی کەسەکان داگیر بکات و هەربۆیە کەوتە بەر ئێرەیی و حەسەدی حەکیمەکانی دیکەی هاورۆژگاری خۆی. ئەوان لەبەر کورت بیریی خۆیان، زۆر بە توندی دڵی ئەویان ئێشاند و تەنانەت

پاش شەهیدبوونی، ئارام نەبوونەوە و ئەو شەهیدە گەورەی جیهانیان لە ریزی شەهیدەکاندا ئەژمار نەکرد و بە سووکایەتی بە "شیخ مقتول" ناویان برد. بە گشت ئەم باسانەوە لە سەدەکانی دواییدا سۆفیەکان و حەکیمەکانی حەق ئەویان ناسی و ریزو حورمەتی زۆریان لیگرت.

شیاوی باسکردنە کە بە پێچەوانەی فەلسەفەی رۆحانی شهاب الدین سەهرەوەردی گرووپێک لە سۆفیەکان گەڕانەوە بۆ دووالیزمی مادی مانەوی. پەیڕەوەکانی ئەم ریبازە هەروەک چۆن عزیز معمد نەسەفی نووسیویەتی، نوور و تاریکاییان بە لازم و مەلزومی یەکتر زانیوە و وتوویانە کە ئەم دووانە وەک دەریای شیر و رۆن پێکەوە ئاوێتە دەبن و دەبنە هۆی زۆربوونی جیهان. ئامانجی مرۆڤ رزگاربوون لە قورسایی زوڵمەتە و نوور کاتێک لە زوڵمەت نەجاتی دەبێت کە دەستی بگاتە خودناسیی.

### گرووپی ئەسحابی فکر

عبدالکریم بن ابراهیم جیلانی نوێنەری گەورەی یەکێکیتر لە لایەنەکان یان گرووپەکانی تەسەوفە، لەدایکبوونی هەروەک خۆی لە شێعرێکدا باسی کردووە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٧٦٧ کۆچی و مەرگەکەی لە ٨١١ دا بوو. جیلانی بە پێچەوانەی محی الدین عەرەبی کە کاریگەرییەتیەکی زۆری لەسەر دانا، نووسەرێکی فرەبێژ نەبوو، هاوکات خاوەنی خەیاڵی شاعیرانە و بلیمەتی فەیلسووفێکیش بوو، شیعری کرد بە ئامێری راگەیاندنی عیرفان و فەلسەفەی بەرزی خۆی و لەسەر کتێبی فتوحات المکیه ابن العربی و هەروەها "بسم الله" شەرحی نووسی و کتێبی بەناوبانگی "انسان الکامل فی معرفه الاواخر الاوائل"ی بەرهەم هێنا. بەپێی جیهانبینی عبدالکریم بن ابراهیم جیلانی، زاتی بحت، یان ساکار چ بوونەوەرێکی بینراو بێت چ بوونەوەرێکی زەینی بێت، ناو و سیفەتگەلێکی زۆری هەیە. بە گشتی بوونەوەرەکان دوو جۆرن:

١. بوونەوەری رەها یان بوونی بنیاتی یان بوونی بێ خەوش یان حەق یان خودا.

٢. بوونەوەری پەیوەست بە نەبوون یان خوڵقاو یان سرووشت.

زاتی خودا عەقلی کاملّە و لە درکدا ناگونجێت و ناوترێت لەبەرئەوەی کە ناسینەکەی پێویستی بە نیسبەت هەیە و زاتی خوداش لە هەر نیسبەتێک بەدەرە، هزری ئێمە کە لە فەزای بەتاڵی بێ سنووردا دەفڕێ، حیجابی ناو و سیفەتەکان دەکاتەوە و لە دەڤەری بەربڵاوی زەماندا تێپەڕ دەبێت و دەگاتە وڵاتی نەبوون و فەنا، لەوە تێگەیشتووە کە خودا یان عەقڵی بوونەکە لاوجودە و کۆی دژوازیەکانە، دوو لایەنی هەیە: ژیانی ئەزەلی لە زەمانی رابردوودا و ژیانی ئەبەدی لە زەمانی داهاتوودا، دوو وەسفی هەیە حەق و خوڵق، دوو پێناسەی هەیە: هەنگاو و رووردراو، دوو ناوی هەیە خودا و مرۆڤ، دوو روخساری هەیە: هەبوون و ئیمکان، دوو متمانەی هەیە: لە یەک متمانەدا بۆ خودی نەبوون و بۆ ئەو شتەی کە خود نییە، هەیە، لە متمانەیەکی تردا بۆ خۆی، هەبوون و بۆ ئەو شتەی کە خود نییە، نەبوونە.

بە باوەڕی جیلانی، ناو، موسەما لە درککردندا قاییم رادەگرێت و لە خەیاڵدا وێنەی پێ دەبەخشێت و تووشی وەهمی دەکات و لە مێشکدا راگیری دەکات، ناو دەرەوە یان توێکڵی موسەمایە و موسەما ناوەرۆک یان کاکڵی ناوە، هەندێ لە ناوەکان بوونی واقیعییان نییە بەڵکو بە ناو بوونیان هەیە، بۆ وێنە "عنقا" کە ناوێکە بێ موسەمای راستەقینە، بەپێچەوانەی عنقا کە نەبوون و غائیبی رەهایە، خودا هەرچەند لەمس ناکرێت یان نابیندرێت بوونە و ئامادەی رەهایە، عنقا تەنها لە زەیندا هەیە بەڵام موسەمای وشەی "الله"بوونی راستەقینەیە، لە هەمانکاتدا خوداش وەک عنقا تەنها بەهۆی ناو و سیفەتەکانی خۆیەوە دەناسرێت، ناو ئاوێنەیەکە کە گشت نهێنیەکانی بوونی رەها ئاشکرا دەکات، ناو، نوورێکە کە خودا بە هۆی ئەوەوە خۆی دەبینێتەوە.

ئەم بابەتە ئیسماعیلیەکانمان وەبیردەخاتەوە کە دەیانویست موسەما لەناو بناسنەوە، بۆ روونکردنەوەی دەبێ باس لە قۆناغە سێ لایەنەکانی جیلانی بکەین کە بۆ کاملٚکردنی بوونی رەها ژماردوویەتی، بەپێی باوەڕی ئەو بوونی رەها یان بوونی بێ خەوش بەهۆی جیابوونەوە لە رەهابوونی خۆی لە سێ قۆناغ تێپەڕ دەبێت:

١. تاکایەتی
٢. شوناس
٣. ئەویەتی

بوونی رەها لە یەکەمین قۆناغدا کە هێشتا لە دەرکەوتە و سیفەت و نیسبەتەکان هیچ ناونیشانێک نییە، ناوی "احد"ە. "احدیت" نیشانەی یەکەمین هەنگاوە کە بوونی رەها بەرەو وابەستەیی هەڵیدەگرێت، بوونی رەها لە دووهەمین قۆناغدا شوناس وەردەگرێت، بەڵام هێشتا لە دەرکەوتە بەدەرە، لە سێهەمین قۆناغدا شوناس لە دەرەوەدا دەنوێندرێت و "ئەویەتی" وەردەگرێت یان بە وتەی هیگڵ بەهۆی لە خود ڕسکاندن واتە Self-Diremption سرووشت پەیدا دەبێت. لەم قۆناغەدا کە قۆناغی وشەی "اللە"یە تاریکایی بوونی رەها هەڵدەستێت و بە دەرکەوتنی سرووشت، بوونی رەها دەستی دەگاتە سەر ئاگا بوونەوە و دەگاتە پلەی ئیلاهی. وشەی "الله" سەرچاوەی گشت کەمالاتی جیاوازی زاتی خودایە، شوناس کە لە قۆناغی دووهەمدا دەردەکەوێت بەردەوام بەشێوەیەکی هێزەکی لە ناو وشەی (اللە)دا بوونی هەیە و هەر ئەم ناوە مەزنەیە کە لە قۆناغی سێهەمدا بەشێوازێکی بیندراو دەردێت و بە درەوشانی خۆیەوە رەشایی و خەمۆکی رەها بە تەواوەتی لادەبات، مرۆڤ ئەگەر مەبەستی دەست گەیشتن بە باشیەکانە دەبێ بەپێی قۆناغە سێ لایەنەکان هەڵسوکەوت بکات، تەرتیبی قۆناغەکانی هەڵسوکەوتی مرۆڤ بە پێچەوانەی قۆناغەکانی خودایە لەبەرئەوەی کە مرۆڤ لە کاری گەشەکردن یان عروجدایە لە

حاڵێکـدا کە بــوونی رەهــا لە گەشــە راوەســتاوە، مــرۆڤ لە ســەرەتای قۆناغەکانی گەشەکردنی رۆحانی خۆیدا سەبارەت بە ناوەکان بیر دەکاتەوە و موتاڵای سرووشت دەکات کە مۆرکی ناوەکانی بەسـەرەوەیە، پاشـان لە قۆناغی دووهەمدا هەنگاو دەنێتە دەڤەری سیفەتەکان و لە قۆناغی سـێهەمدا دەگاتە زاتـی خـودایی، لەم هەنگـاوەدایە کە کامڵ دەبێت، چاوەکانی چـاوی خودا و وتەکانی وتەی خودا و ژیانەکەی دەبێتە ژیانی خودایی و لە ژیـانی گــشتی سرووشــتدا بەشــداریی دەکــات و دەکێــشرێتە نــاو نــاخی ژیــانە شتەکانەوە.

ئەو بـاوەڕەی کە جیلانـی سـەبارەت بە دەرکەوتە یـان سـیفەت باسـی لێکـردووە زۆر گـرنگە لەبەرئەوەی کە ئەو لە گریمانەخوازەکـانی هینـد جیـا دەکاتەوە. بەپێی دەنگی ئەو، دەرکەوتە یان سیفەت ئامێرێکە کە شـتەکان بە ئێمە دەناسێنێت، جیاکردنەوەی دەرکەوتە لەو بابەتەی کە سـەرچاوەکەیەتی یــان حەقیقەتــی هەڵگــری ئەوە، تەنهــا لە دەڤەری روخــسارەکاندا مــسۆگەر دەبێـت، لەم دەڤەرەدایە کە لە نێـوان دەرکەوتە و سـەرچاوەکەی نـامۆییەک هەیە، سەرچاوەکان دوور نین لە تێکەڵایەتی و هەوڵدان و هەربۆیە تووشـی نامۆیی دەبن.

لەم دەڤەرەدا نیـشانەیەک لە تێکەڵکـردن و هەوڵــدان نیـیە، لەم خاڵەیـدا جیلانی بە تەواوەتی لە ئاییني مایا دوورکەوتەوە و دنیای ماددی بە بوونی حەقیقـی زانیـوە و باسـی لەوە کـردووە کە دنیـای مـاددی لایەنـی دەرەکـی بوونی رەهـایەو هەرچەند لایەنـی دەرەوەیە، بەڵام واقیعە، جیهـانی دیـار لە زاتێکی حەقیقی هەڵناگیرسێت کە لە نـاو هەنـدێ روخسـاردا شـاردرابێتەوە. جیهانی دیار هەمان وێنەیە کە لە زەینی ئێمەوە دێت. جیلانی بەرەو بڕوای بارکلی و فیختە ڕۆی و گەیشتە تیۆری هیگڵ سـەبارەت بە یەکیەتـی فکـر و بوون، لە بەشی سی و حەوتەم لە بەرگی دووهەمـی انسان الکامل ئاشـکرا باســی لەوە کــردووە کە ئەم جیهــانە جیهــانێکی گریمــانەییە و مــاددەی

سرووشـت هـیچ نییه بێجگه له گریمـانه یـان درک یـان فکـر. تـۆ که نـاو و سـیفەت بـۆ خـوا نـاوزەد دەکەیت، ئایا نـابێ ئەم بیروبـاوەڕەت بخەیتە بەر لێکدانەوە؟ ئەم باوەڕەی تۆ له کوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ له خەیاڵەوە دێت و بەس! سرووشت هیچ نییه بێجگه له خەیاڵێکی دەرکەوتە.

باسـەکەی جیلانـی لەگەڵ ماددەکـانی کتێبـی "هـزری پەتـی" کانـت دا بە تەواوەتی یەکدەگرێت. جیلانی بەڵام بە پێچەوانەی کانت "شی فی النفسه"ی قبـووڵ نەکـرد، له روانـگەی ئەوەوە تەنـانەت زاتـی گـشت روخـسارەکانی جیهانیش گریمانەیە و بوونی لەناو نەفسی خودی کانت، هیچ نییه بێجگه له دەرکەوتە یـان سـیفەتەکان، هـیچ شـتێک له پشت دەرکەوتەکانـدا نییه، شـتە راستەقینەکان هەمان دەرکەوتەکانن و جیهانی ماددی هەمان بوونی رەهایە و بەپێـی بـنەڕەت گەلێکـی دژواز که له زاتـی بـوونی رەهـاوە سـەرچاوە دەگرێـت، سـاز دراون. سرووشـت دەڵێـی خـودایە و بـۆ خودناسـینی ئەو پێویستە که سرووشت بناسین.

هەروەک هیگـڵ باسـی له یەکیەتـی نێـوان فکـر و بـوون کـرد، جیلانـی سـەبارەت بە یەکیەتی دەرکەوتە و حەقـیقەت دوواوە و جیهـانی مـاددی بە "جیهـانی دەرکەوتەکـان" نـاوبردووە، لەم ناولێنـانە که تـا رادەیەک خـوێنەر تووشــی هەڵە دەکــات ئــاوا دەردەکەوێــت که جیــاکردنەوەی دەرکەوتە له حەقیقەت یان زات، جیاکردنەوەیەکی رواڵەتییە، ئەم جیـاکردنەوە هەرچەنـد تێگەیـشتن له جیهــانی دەور و پــشتی ئــێمە ئاســانتر دەکــاتەوە و بۆمــان بەسوودە، بەڵام راستەقینە و رەها نییە، هەربـۆیە ئیدەی جیلانـی هەرچەنـد هاوشــێوەی ئیــدەئالخوازیی ئەزمــوونی هــاوچەرخ واته Empirical Idealism یە بەڵام رێک وەک ئەوە نییە، جیلانـی حەقیقەتـی بینـدراوی له خۆیـدا قبـووڵ کـرد بەڵام جەختـی کـردووە له یەکیەتـیەکەی و گەیـشتە ئەم خاڵە که جیهانی ماددی هەمـان حەقیقەتـی پەتییە، لایەنـی دیکە و دەرەوەی حەقیقەتە، ئەم روخسارە دەرەکییەی حەقـیقەت که بەرهەمـی خودڕسـکاندنە

له خودا، له حەقیقەت جیا نییە، ئەمە ئێمەین کە بۆ یاسانکردنەوەی ناسینی خۆمان سەبارەت بە جیهان لە نێوانیاندا جیاوازی دادەنێین، بە وتەی جیلانی ئەگەر دەرکەوتە و حەقیقەت یەکنەبن ئەی چۆن یەکێک لەوانە ئەویدی دەردەخات؟

کۆکراوەی وتەکان ئەمەیە کە لە فەلسەفەی جیلانییدا بوونی رەهای پەتی هەمان حەقیقەتی رەهایەو ئەم بوونی رەهایە لە دەرکەوتە یان روخسارە دەرەکییەکانیدا تیشکدەداتەوە، تا کاتێک کە یەکیەتی دەرکەوتە و حەقیقەت نەزانین جیهانی ماددی یان جیهانی دەرکەوتەکان دەبن بە حیجابی تێگەیشتنی ئێمە، بەڵام کاتێک کە لەم خاڵە تێبگەین ئەو پەردەیە لادەچێت، لەوکاتەدایە کە لە هەموو شتێکدا زات دەبینینەوە و ئەوە قبووڵ دەکەین کە سیفەتەکان لە فکری ئێمەوە بوون، سرووشت لە شێوازی راستەقینەی خۆیدا روخساری خۆی دەردەخات و نامۆیی بە تەواوەتی لادەچێت. لەگەڵ سرووشتدا یەکدەگرین و گرێ کونجکۆڵی ئێمە سارد دەبێتەوە و حەزی گەڕانی ئێمە دەگۆڕدرێت و دەبێتە هێمنایەتیەکی فەلسەفی، ئەو کەسەی کە دەستی بگاتە ئەم یەکیەتییە ئیتر کاری بە داهێنەرایەتییە زانستیەکان نییە و ئایینیش کە باس لە دەسەڵاتی ئەوپەڕی سرووشت دەکات کاری بەسەر ئەوەوە نابێت، ئەمەیە رزگاریی رۆحیانەت، جیلانی ئەو ناو و سیفەتانەی خودا کە لە سرووشتدا دەردەکەون و لە حوکمی دەرکەوتەی ئیلاهیین بەم شێوە پۆلێنبەندی دەکات:

١. ناوو سیفەتە زاتییەکان وەک: الله، احد، فرد، نور، حق، قدوس، حی.

٢. ناوو سیفەتگەلی جەلالی وەک: کبیر، متعال، قادر.

٣. ناوو سیفەتگەلی کەمالی وەک: خالق، غنی، اول، آخر.

٤. ناوو سیفەتگەلی جەمالی وەک: لم یولد، رحیم و مبدا.

جیلانی ئەوەی لێکداوەتەوە کە هەرکام لە ناو و سیفەتەکان خاوەنی هێزی تایبەتن و بەپێی ئەوەش لە مرۆڤ و سرووشتدا دەردەکەوێت، جیلانی بەپێی

کەسایەتی عارفانەی خۆی سەبارەت بە چۆنیەتی ڕوودانی ئەو دەرکەوتانە و گەیشتنی مرۆڤ بەوانە بێدەنگ بووە و بەم بێدەنگییە ئەوەی ڕاگەیاند کە لەم باسانەدا دەبێ ئاوڕ لە "مرشد و ارشاد" ی ڕۆحی بدرێتەوە.

بەرلەوەی کە باس لە باوەڕی جیلانی بکەین سەبارەت بە ناوو سیفەتەکانی خودا، ئاماژە بەو لێکچوونە دەکەین کە لە نێوان ئەندێشەی جیلانی و شلایر ماخر دا هەیە. خودای جیلانی کە خاوەنی ناو و سیفەتی جیاوازە زۆر لە خودای شلایر ماخر دەچێت. ئەم حەکیمە خواییە ئەڵمانییە گشت سیفەتەکانی خودای بە سیفەتی دەسەڵات ناساند، جیلانی هەرچەند سڕینەوەی سیفەتەکانی خودای دژ بە بەرژەوەندی زانی، دیسان وەک شلایر ماخر باسی لەوە کرد کە خودا لە زاتی خۆیدا یەکیەتییەکی سەقامگرتووە و ئەو سیفەتانەی کە بۆ ئەویان ناو بردووە، بریتیین لە کۆمەڵێک وێنە کە بەپێی بەرژەوەندی جیاوازی مرۆیی گەیشتوونە زەینی مرۆڤەوە، ئەو سیفەتانەی کە بەویان چەسپاندووە، ڕوخسارگەلێکن لەو هۆ نەگۆڕەی کە بە حوکمی خۆی و بەپێی ڕوانینە جیاوازەکانی مرۆیی هاتوونە عەقڵی سنوورداری ئێمەوە.

خودا لە بوونی ڕەهای خۆیدا لە سنووری ناوو سیفەتەکان بەدوورە و تەنها کاتێک کە لە ڕەهابوون دوور دەکەوێت و ڕوخساری دەرەکی بە خۆی دەبەخشێت و سرووشت دەخوڵقێنێت، مۆرکی ناوو سیفەت دەدرێت لە تان و پۆی بەرهەمەکانی.

جیلانی سەبارەت بە ناوو سیفەتەکانی تایبەتی خودا وای وتووە کە: یەکەمین ناوی تایبەتی خودا "اللە"یە و ئەم ناوە لە ناوگەلە زاتییەکانە و دەلالەت دەکاتە گشت حەقیقەتەکانی بوون و سیستمی ئەو، خودا لەبەرئەوەی کە واجب الوجودە، ناوی اللە یە، ئیلاهیەت سەرترین دەرکەوتەی بوونی ڕەهایە و تەنها لەبەرئەوە جیاوازە کە بوونی ڕەها خۆی بیندراوە، بەڵام شوێنەکەی نەبیندراوە، سرووشت کە نیشانەیەکە لەو

شیاوی دیتنە، سرووشت هەرچەند ئیلاهیەتی دەرکەوتەیە، بەڵام ئیلاهیەتی راستەقینە نییە، ئیلاهیەت وەک ئاوە و سرووشت لە حوکمی ئاوی بەستراو یان سەهۆڵە و دیارە کە سەهۆڵ، ئاو نییە.

بەپێی روانگەی جیلانی کە لە واقیعیخوازی سرووشتی Natural Realism یان ئیدەئالیسمی رەها IdealismAbsolute) نزیکە، زات شیاوی دیتنە، بەڵام لە هەمان حاڵدا گشت سیفەتەکانی بۆ ئیمە دیار نییە و تەنانەت سیفەتە ناسراوەکانیشی هەروەک چۆن هەن، بۆ ئێمە دەرنەکەوتووە و تەنها سێبەرەکان و نیشانەکانیان لە ناسینی ئێمەدا گونجاون، بۆ وێنە کردەوەی چاک لە نەفسی خۆیدا نەناسراوە، بەڵام بەرهەمەکانی کە دەبێتە یارمەتیدانی خەڵکی هەژار، دەبیندرێت و دەناسرێتەوە، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سیفەتەکان وەک زاتن و سیفەت کاتێک بە تەواوەتی دەناسرێت کە لە زات جیا بێتەوە، خودا بەدەر لە الله، ناوگەلێکی زاتی دیکەی هەیە، بۆ وێنە (احد) و (واحد)، کاتێک کە بوونی رەها لە زوڵمەتی تاریکەوە واتە "ودان تای" لە مایای سەرەتاوە هەنگاوێک بەرەو نوور هەڵدەگرێت، ئەحەدیەت مسۆگەر دەبێت. ئەحەدیەت هەرچەند کە هاوتای هیچ جۆرە دەرکەوتەیەکی دەرەکی نییە، بەڵام گشت دەرکەوتەکانی دنیای دەرەوە لە خۆیدا ک دەکاتەوە، کاتێک کە سەیری دیوارێک دەکەن گشت و کۆی دیوارەکە دەبینن، بەڵام یەک بە یەک و پاژە و کەرەستەکانی نابینن، دیوار بابەتێکی تاقانەیە و تاکایەتیەکەی هەمان رۆحی زۆرینەیە.

ئەحەدیەت قۆناغێکی تری بوونی رەهایە و لەگەڵ دەرکەوتەی دەرەکییدا هاوڕایە، لە بەرامبەر ئەحەدیەتدا کە لە گشت ناوو سیفەتە تایبەتەکان بەدەرە، ناوو سیفەتەکانی لە یەکتر جیا ناکرێنەوە و هەرکامیان دەبن بە زاتی ئەویدی، ئەحەدیەت هاوشێوەی ئیلاهیەتە بەم جیاوازیەوە کە ناوو سیفەتە ئیلاهیەکان لە یەکتر جیا و دژوازن، بۆ وێنە سفەتی "غفور" دژ بە سیفەتی "منتقم"ە، قۆناغی واحدیەت هاوانی "سفر وجود" ی هیگڵە و بە رەحمانیەتیش دەناسرێت، رەحمانیەتی سەرەتایی بووە هۆی ئەوەی کە بوونی رەها لە خۆی بڕسکێت و

ببێتە پێکهێنەری جیهان، بوونی رەها یان خودا لە حوکمی ئاودایە و جیهان یان سرووشت وەک ئاوی سەهۆڵ بەستووە، "الله" ناوی حەقیقی سرووشتە، هەروەک چۆن "ئاوی بەستوو" یان "سەهۆڵ" ناوی وەرگیردراوی ئاوە، جیلانی لە بابەتێکی تریشدا ئاوی بە بنەڕەت ناسی و بە عەقڵ و درک و فکر و وێنەکردنی پێناسە کرد، هەرگیز نابێ وای دابنێین کە جیلانی باوەڕی هەیە بە حلوولی خودا لە سرووشت و جیهانی ماددیدا، ئەو خۆی دەنگی هەڵبڕی سەبارەت بەوەی کە چەمکی حلوول لەخۆگری سڕینەوەی بیروباوەڕە لە هاوسانی بوون، خودا لە بووندا حلوولی نەکردووە لەبەرئەوەی کە خوا رێک خودی بوونە، بوونی دەرەکی لایەنێکە لە خودا، نوورێکە کە خودا بە خودا دەنوێنێتەوە، هەروەک چۆن خودای ئەندێشەیەک لە ئەندێشەکەدا بوونی هەیە، ئاوا خوداش لە ناو سرووشتدا بوونی هەیە، جیاوازی نێوان خودا و مرۆڤ لەوەدایە کە ئەندێشەی خودا بە خۆی دەرکەوتەی ماددی دەبەخشیت بەڵام ئەندێشەی مرۆڤ وەها تواناییەکی نییە، دەوترێ کاتێک کە هیگڵ تاوانبار کرا بە ئەندێشەی هەمەخودایی، بۆ پاساوهێنانەوەی خۆی ئەم ئیستدلالەی هێنایە ئاراوە.

سیفەتی رەحمانیەت لەگەڵ سیفەتی ئیرادەدا پەیوەستەیەکی نزیکی هەیە، ئیرادە بۆ هەموو بوون پێویستە و تەنانەت ئاوێک کە دەگاتە گیا، لە ئیرادەوە هێز وەردەگرێت، جیلانی هۆی گشت ئەو نموودانەی بە ئیرادە باس کرد کە فەیلەسووفە سرووشتیەکان بە "هێزەکانی سرووشتی" ناو دەبەن، بە پێچەوانەی ئەوان هۆکەی نەناسراو نەزانی بەڵکو رایگەیاند کە شتێک لەوپەڕی هۆکەدا هەیە و ئەویش هەمان بوونی رەهایە.

ئێستا کە باسەکەمان سەبارەت بە ناوو سیفەتەکانی خودا کۆکردەوە، ئاوڕ لە بابەتی بوونی پێش خوڵقاندن دەدەینەوە. هەروەک جیلانی ئاماژەی داوە، پرسیاریان لە پێغەمبەری ئیسلام کرد کە خودا بەر لە خوڵقاندن لە کوێ بووە؟ پێغەمبەر وەڵامی دایەوە کە خودا بەر لە خوڵقاندن لە "عمی" دا بووە. ئێستا دەبێ ببینین کە مەبەست لە عمی چییە؟ عمی هەمان نابینا بوون یان

تاریکایی سەرەتای بوونە. ئەگەر بمانەوێ هاومانایەکی لە ناو دەروونناسیی ئەمڕۆدا بۆ بدۆزینەوە دەبێ کەڵک لە وشەی" نائاگایی" (Unconsciousness) وەربگرین، بە راستی جیلانی بە هێنانە ئارای ئەم چەمکە پێشبینی یەکێک لە بنەڕەتەکانی دەروونناسی ئەمڕۆی ئەڵمانی کرد. عمی یان نائاگایی کە هەمان حەقیقەتی واقیعەکان یان بوونی پەتی و بنەڕەتییە لە سیفەتەکانی خودا و خەڵق ئازادە، پێویستی بە ناوو سفەت نییە و لە بنەڕەتەوە لە دەڤەری نیسبەتەکان بەدەرە، لە ئەحەدیەت جیاکراوەتەوە، بەڵام کاتێ رێگەی هاتنەخوارەوە دەگرێتەبەر و دەرکەوێت، دەبێتە ئەحەدیەت، کاتێ باس لە پێش بوونی خودا و لەدوابوونی خەڵق دەکەین، مەبەستمان پێش و دوای زەمان نییە، زەمان و بەدواهاتی زەمانی و شوێن خۆیان خوڵقاون و هەندێ لە خەڵق ناتوانێت لە نێوان خودا و خوڵقاوەکەیدا جیاوازی دانێت، لەم باسەدا وشەگەلێک وەک پێش، دوا، کوێ و لە کوێوە، نە زەمان یان شوێنەوە ناچەسپێت. بوونی پەتی لە تێگەیشتنی مرۆییدا ناگونجێت، هیچ کام لە مەقوولاتی بوونی ماددی بۆ ئەوە راست دەرنایەت، بە وتەی کانت یاساکانی نموودەکان لەسەر دەڤەری بووندا حکومەت ناکەن.

مرۆڤ لە رێگەی کەمالدا لە سێ قۆناغەوە تێپەڕ دەبێت. قۆناغی یەکەم قۆناغی عەقڵ سەبارەت بەناو یان بە وتەی جیلانی، تجلی اسمایە، ئەو دەڵێت: "کاتێک ناوی الله بەسەر کەسێکدا بدرەوشێت ئەو کەسە لە ژێر تیشکی درەوشاوەی ئەو ناوەدا لە بەین دەچێت". هەروەها "کاتێک تۆ بانگی خودا دەکەی، ئەو مرۆڤەیە کە وەڵامت دەداتەوە"، بە زمانی شۆپینهاوێر، ئیرادەی تاک بە هۆی ئەم دەرکەوتەوە لەناودەچێت، بەڵام لەبەین چوونی ئیرادە ناگاتە مەرگی جەستەیی و لەوە بەدواش تاک هەروا دەژی و بە وتەی کاپلا بەهۆی یەکگرتن لەگەڵ پراکریتی (Prakriiti) وەک مەکینەی خوری رستن دەسوڕێتەوە، لەم حاڵەتەدایە کە تاک بە هۆی ئەوینی خوداییەوە دەبێژێ:

**"ئەو، من بوو و منیش، ئەو بووم**

**کەس نەبوو لە نێوان ئێمەدا جودایی بخات.**

**واتە: فکنت اناهی و هی کانت انا، وما**

**لها فی وجود مفرد من ینازع".**

دووهەمین قۆناغی پەروەردەی رۆحانی، قۆناغی دەرکەوتەی سیفەتەکانە، مرۆڤ لە پلەی ئەم دەرکەوتەدا بە پێی شایستەیی خۆی سیفەتەکانی خودا بەو جۆرەی کە هەیە وەردەگرێت، تاکەکانی مرۆڤ بەپێی بەهرەیەک کە لەم دەرکەوتەیە وەریدەگرن لە چەند گرووپی جیاوازدا کۆدەبنەوە، گرووپێک لە خەڵک لە دەرکەوتەی سیفەتی ئیلاهی ژیان بەهرە وەردەگرن و بە بەرەکەتی ئەوە لە نەفسی جیهاندا بەشدار دەبن، بەرهەمی ئەم دەرکەوتەیە کارگەلێکە وەک لە هەوادا فڕین، بەسەر ئاودا رۆیشتن و گۆڕانکاریی لە قەوارەی شتەکاندا، ئەو جۆرە کردەوانەی کە مەسیح ئەنجامی دەدا.

قۆناغی سێهەم قۆناغی دەرکەوتەی زاتە، مرۆڤ پاش ئەوەی کە بەهرەی لە گشت سیفەتە ئیلاهیەکان وەرگرت، لە دەڤەری ناوو سیفەت دەترازێت و هەنگاو دەنێتە ناو دەڤەری زات یان بوونی رەها، هەروەک باسکرا، بوونی رەها یان تەرککردنی پەتی بوونی خود، لە سێ قۆناغەوە تێپەڕ دەبێت و لە هەر قۆناغێکدا پەتی بوونی ئەو دەگاتە جۆرێک بەندبوون یان تایبەتکردن، هەرکام لەو قۆناغە سیانییە وابەستەی ناوێکی زاتییە و هەر ناوێک نەفسی مرۆیی بەهرەمەند دەکات لە دەرکەوتەیەکی تایبەت، بەم شێوەیە کە ئەخلاقی رۆحانی جیلانی دەگاتە ئەنجامی خۆی، مرۆڤ کەماڵ وەردەگرێت و پەیوەند دەدرێتە بوونی رەها و بە زبانی هیگڵ لەگەڵ فەلسەفەی رەهادا هاوژین دەبێت و دەبێتە نموونەی کەماڵ و بابەتی پەرەستش کردن، دەگاتە شوێنێک کە مرۆڤ بوون و ئیلاهیەت لە زاتی ئەودا یەکدەگرن و ئەو دەکەن بە خودا- مرۆڤ.

جیلانی ئەوەی روون نەکردەوە کە مرۆڤی کامڵ لە چ ڕێگەیەکەوە دەگاتە تەشقی کامڵبوونی رۆحانی، بەڵام ئەوەی روونکردەوە کە مرۆڤ لە هەرکام لە قۆناغەکانی سلووکدا دەست دەداتە جۆرێک تاقیکردنەوەی تایبەت کە بە تەواوەتی لە چلکی گومان و مشەوەش بوون بەدوور و خاوێنە، ئەم تاقیکردنەوە بە هۆی دڵەوە روو دەدات، پێناسەکردنی دڵ زۆر دژوارە و جیلانی بە شێوەگەلێکی زۆر شاراوە وەسفی دەکات کە دڵ چاوێکە کە ناوو سیفەت و زاتی رەها یەک لە دوای یەک دەبینێت، دڵ لە ئاوێتەبوونی نەفس و هزر دروست دەبێت و بە حوکمی زاتی خۆی دەبێتە هۆی ناسینی حەقیقەتە نیهاییەکانی بوون، دڵ سەرچاوەی زانستێکە کە ودان تای بە "معرفت اشرف" ناوی بردووە، دڵ وەها راستی گەلێک پیشانی کەسەکە دەدات کە بۆ ئەو دەرەکی و نامۆ نین، ئەو شتەی کە لەم ڕێگەوە بۆ کەسەکە ئاشکرا دەبێت حەقیقەتی خودی خۆیەتی، بوونی نیهایی خۆیەتی.

ئەم تایبەتمەندییە کە دڵ لە هزر جیا دەکاتەوە لەبەرئەوەی کە هزر بە پێچەوانەی دڵ، راستی گەلێکی وا دەگەیەنێتە تاک کە لە زاتی ئەو جیاوازن، بە باوەڕی جیلانی و دیەکی سۆفیە هاوبیرەکانی ئەم تاقیکردنەوە رۆحانییە زوو تێپەڕ دەبێت، بە وتەی مات دیو ئارنۆلد، ساتەکانی بیرکردنەوەی قووڵ لە فەرمانی ئێمە بەدەرن، لەم ساتانەدایە کە مرۆڤ نهێنی بوونی خۆی دەناسێت و خۆی بە شێوەی خودا- مرۆڤ دەبینێت، هەر ئەوەندە کە ئەم دەرکەوتە رۆحانییە تەواو ببێت، بە خێرایی خودا- مرۆڤ لێکدەبێتەوە، مرۆڤ دەکەوێتە لایەک و خودا لایەکیتر، بێگومان ئەگەر ئەم تاقیکردنەوە رۆحانییە پابەرجێ دەبوو، خوازەی کامڵبوونی مرۆڤ کە هێزێکی ئەخلاقی گەورەیە لە بەین دەچوو و هەروەها کۆمەڵگە بە تەواوی تێکدەشکا، تیۆری سێ کوچکەی جیلانی شیاوی سەرنج پێدانێکی زۆرە، بینیمان کە بوونی رەها لە سێ قۆناغەوە تێپەڕ دەبێت و سێ جۆرە بوونی پەتی لێدەبێتەوە، لە قۆناغی سێهەمدایە کە بوونی رەها بە ڕسکاندنی خۆی لە دەرەوە دەردەکەوێت و بە شێوازی مرۆڤ و خودا دیار دەبێت و بە هۆی ئەوە جیاوازیش روو دەدات.

ئێستا ئەوەش بە وتەکانمان زیاد دەکەین کە مرۆڤی کامڵ لە ژێر تیشکی سیفەتە ئیلاهی و مرۆییەکانی خۆیدایە کە دەتوانێت ئەم جیاوازییە لەناوبەرێت. مرۆڤی کامڵ راگری جیهانە و دەرکەوتنی مرۆڤی کامڵ مەرجی مانەوەی سرووشتە، بوونی رەها پاش ئەوەی کە رەهایەتی خۆی جێ دەهێڵێت، بە واسیتەی مرۆڤی کامڵ یان مرۆڤ- خودا دەگەڕێتەوە خۆی، ئەگەر لەبەر مرۆڤ- خودا نەدەبوو، سرووشت جلی بوونی لەبەر نەدەکردو هەروەها ئەو نوورەی کە خودا پیشان خۆی دەکات ساز نەدەدرا، ئەمانە پیکهێنەری بنەڕەتێکی پڕ لە موناقەشەن کە لە زاتی رەهاوە دێتڕ جیلانی لەم بارەوە ئاوەها دەڵێت:

**ان قلت، واحده، صدقت: و ان تقل:**

**اثنان، حق- انه اثنان؛**

**او قلت: و بل انه لمثلث،**

**فصدقت؛ ذاک حقیقه الانسان!**

لەم حاڵەدایە کە مرۆڤی کامڵ جۆرێک بازنەی پەیوەست بوونە، لە لایەکەوە ناوە زاتییەکان بۆ ئەو دەردەکەون و لە لایەکیترەوە سیفەتە ئیلاهیەکان لەودا نمود پەیدا دەکەن، ئەم سیفەتانە ئاوەهان:

١. ژیان یان بوونی سەربەخۆ.

٢. زانست کە روخسارێکە لە ژیان بەپێی ئایەتێکی قورئان.

٣. ئیرادە یان بنەڕەتی تایبەت بوون یان دەرکەوتەی بوون، ئیرادە روخساری زانستی خودایە بەپێی پێویستییەکانی زاتی ئەو، ئیرادە کە بەم پێناسەوە لایەنێکی زانستە نۆ روخساری هەیە هەر نۆ، دەکرێ بە عەشق ناوی بەرین. دوایین روخسار و سەرچاوە ئەو عەشقەیە کە عاشق و مەعشووق یان عالەم و مەعلووم پێکەوە پێوەند دەدات و دەیانکات بە یەک. ئەم عەشقە هەمان زاتی رەهایە و بە وتەی مەسیحییەکان، خودا هەمان عەشقە، جیلانی ئەو کردەوەی کە لە ئیرادەیەکی بچووکەوە دێت بە هۆکار ناو

دەبات بەڵام کردەوەی ئیرادەی گشتی بە ناهۆکار ناو دەبات و بەم شێوەیە بە پێی تیۆری ئازادی هیگڵ کردەوەکانی مرۆڤ هەم بە ئیختیار و هەم بە ئیجبار دەزانێت.

٤. هێزێک کە لە خۆڕسکانی زاتی ڕەها یان لە کاری خوڵقاندا خۆی دەرنوێنێت. لەم بارەوە جیلانی لەگەڵ ئیدەی محی الدین عربی دا دژایەتی دەکات. ئیبن عەرەبی لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە جیهان بەر لە خوڵقان لە زانستی خودادا بوونی هەبووە، جیلانی ئاماژەی بەوەدا کە ئەگەر باوەڕمان بە باسەکەی محی الدین عربی هەبێت، ئەوە دەبێ قبووڵ بکەین کە خودا جیهانی لە هیچەوە نەخوڵقاندووە، بە باوەڕی ئەو جیهان بەرلەوەی کە بە شێوەی بابەتێکی زەینی بوونی هەبێت، دەبووا بەشێک بووایە لە زاتی خودا.

٥. کەلام یان تیشکدانەوەی زانستی خودا، هەر بابەتێکی مسۆگەر کراو، وشەی خودایە و بەم شێوەیە سرووشت سەرانسەر وشەی خودایە، وشەیەک کە بە شێوازی ماددی دەرهاتووە. وشەی خودا ناوگەلێکی جیاوازی هەیە: اعیان ممکنات، حقایق الانسان، ترتیب الوهیت، بساطت وحدت، تفصیل غیب، صور زیبایی، آثار اسما و صفات، معلومات حق.

٦. سمع یان هێزی بیستنی دەنگە نەبیستراوەکان.

٧. بصر یان هێزی دیتنی دیمەنی نەبیندراو.

٨. جمال یان جوانی، سرووشت تیشکدانەوەی جوانییە و هەموو شتێک تەنانەت ئەوەی کە بە جوان نازانرێت لەناو بوونی حەقیقی خۆیدا جوانە. ناحەزی بوونێکی ڕێژەییە و حەقیقەتی نییە و تاوانیش ناحەزییەکی ڕێژەییە.

٩. جلال یان شکۆ کە هەمان جەماڵە لەوپەڕی هێزییدا.

١٠. کمال کە زاتی نەناسراوی خودایە و هەربۆیە بێ سنوور و بێ کۆتاییە.

له سەردەمی زاڵبوونی تاتارەکان بەسەر ئێراندا پێشکەوتنی فکری ئەستەم بوو، لەبەرئەوەی کە تاتارەکان لە فەرهەنگ بەدوور بوون و سەرنجیان نەدەدایە سەربەخۆیی ئەندێشە، هەرلەم سەردەمەدا تەسەوف بە هۆی پەیوەندیەکەوە کە لەگەڵ ئاییندا هەیبوو درێژەی بە ژیانی خۆی دا، لە لایەکەوە بەپێی چەمکە پێشووەکان دەستی دایە دارشتنی سیستەم و لە لایەکی تریشەوە چەمکگەلی نوێی ساز کرد، زانستەکانی دیکە و هەروەها فەلسەفەی پەتی کە تاتارەکان پێیان خۆش نەبوو، بەرەو سەرولێژی رۆیشتن، تاتارەکان فیقهی حەنەفییان بە تەشق و کەمالی هزری مرۆیی دەزانی و بێ پرسیار و لێکدانەوە پەسەندیان دەکرد و هەربۆیە مەجالیان نەدایە وردبینییەکانی فیقهی، لەم حاڵەتەدا زانستی شەریعە ئیتر پەرەی نەسەند، لە زووترین کاتدا گرووپە فکرییە پێشووەکان بێ دیسیپلین بوون و گەلێک لە بیرمەندەکان وڵاتی ئاشنای خۆیان جێهێشت و بە هیوای بارودۆخێکی باشتر هەڵاتن بۆ وڵاتەکانی تر، لە سەدەی دەهەمی کۆچییدا گرووپێک لە ئەرەستۆییەکانی ئێران و هەروەها دستور اصفهانی، هیربد، منیر و کامەران روویان کردە هیندستان، لەو رۆژگارەدا اکبر شاه ئیمپراتووری هیند بوو، دەیویست ئایینێکی نوێ بەپێی ئایینی زەردەشت پێکبهێنێت و لە نێوان خەڵکی دەرباری خۆیدا کە زۆربەیان ئێرانی بوون، پەرەی پێبدات، بەپێی ئەم بارودۆخە تا سەدەی یازدەی کۆچی هیچ بیرمەندێکی گەورە لە ئێراندا سەری هەڵنەدا.

له سەدەی یازدەی کۆچیدا صدرالدین محمد شیرازی ناسراو بە صدر المتالهین یان ملا صدرا بە لۆژیکێکی بەهێز دەستبەکار بوو و سیستمێکی فەلسەفی دارشت، لە سیستمی صدرالدین دا حەقیقەت هەمان گشتی شتەکانە و لەهەمانکاتدا هێچ کام لە شتەکان نییە- بسیط الحقیقه کل اشیا لیس بشی منها- زانستی راستەقینە بەرهەمی یەکیەتی زەین و عەینە، گۆبی نۆ، نووسیویەتی کە صدرالدین دەستی دایە زیندووکردنەوەی سیستمی ابو

علی سینا، بەڵام گۆبی نۆ ئەم خاڵەی لەبیرچوو کە صدرالدین بە یەکیەتی عاقل و معقول فکری ئێرانی کامڵکرد کە بەرەو تاکخوازیی ڕۆیشتبوو هەروەها بووە بنەمای فکری بابی.

پاش صدرالدین فەلسەفەی ئێرانی بە تەرککردنی ئایینی نوێ ئەفلاتوونی ڕوویکردە فەلسەفەی ڕەسەنی ئەفلاتوون، نوێنەری گەورەی ئەم گرووپە نوێیە مەلا هادی سەبزواری گەورەترین بیرمەندی ڕۆژگاری هاوچەرخی ئێرانە، کەواتە هەڵسەنگاندنی فەلسەفەی ئەو بۆ ناسینی چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەم سەردەمەی ئێران پێویستە، بۆ ئەم ئامانجە کتێبی اسرار الحکم بەرهەمی ئەو دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە، لە وانەکانی فەلسەفەی سەبزوارییدا دەگەینە سێ چەمکی بنەڕەتی کە لەگەڵ فەلسەفەی ئێرانی ئیسلامییدا پەیوەندیەکی نەپچڕاوەی هەیە:

١. چەمکی یەکیەتی ڕەهای حەقیقەت یان حەق یان زاتی بوون کە ناوی نوورە.

٢. چەمکی کامڵبوون کە لە ئایینی زەردەشتدا لە پەراوێزی بابەتی چارەنووسی نەفسی مرۆییدا بۆتە شێوازێکی ئاڵۆز و شاراوە، بەڵام لە بەرهەمەکانی نوێ ئەفلاتوونی و سۆفیەکاندا بە کراوەیی و دیسیپلینەوە باسکراوە.

٣. چەمکی واسیتەیەک کە حەقیقەت پەیوەند دەداتەوە بە بابەتە ناحەقیقیەکان.

بەر لە لێکدانەوەی فەلسەفەی سەبزواری باسکردن لە خاڵێک سەبارەت بە بێمتمانە بوونی ئایینی نوێ ئەفلاتوونی بە پێویست دەزانرێت. هەروەک چۆن بیرمەندە ئێرانییەکان بەرە بەرە لە تیۆری نوێ ئەفلاتوونیەکان لایان دا و لەگەڵ فەلسەفەی ئەفلاتووندا ئاشنا بوون، عەرەبەکانی ئیسپانیاش لە ئایینی نوێ ئەفلاتوونی دوورکەوتنەوە و ڕوویان کردە فەلسەفەی ئەرەستۆ. ئەم دوو گۆڕانکارییە بۆ سەلماندنی بلیمەتبوونی ئێرانی و

عەرەبەکان بەسە، لوویس لە مێژووی فەلسەفەی خۆیدا ئاماژە بەوە دەدات کە عەرەبەکان لەبەرئەوەی کە فەلسەفەی ئەفلاتوونیان نەدەناسی هۆگری فەلسەفەی ئەرەستۆ بوون، من باسەکەی لوویس بەهەڵە دەزانم، بە ڕای من فەلسەفەی ئەفلاتوون تەنانەت ئەگەر لە سەرەتای ئیسلامیشەوە لە بەردەستی عەرەبەکان بوایە نەیدەتوانی ئەوان بەرەو خۆی ڕاکێشێت، لەبەرئەوەی بلیمەتیی پراکتیکی عەرەبەکان لەگەڵ وەها فەلسەفەیەکدا سازگار نییە، لە نێوان سیستمە فەلسەفیەکاندا ئەوەی کە دروست گەیشتە دنیای ئیسلام سیستمی نوێ ئەفلاتوونی بوو، ئەم ئایینە بە هۆی ئاماژەکانی موسوڵمانەکان بەرەبەرە وەلانرا هەتا ئەو کاتەی عەرەبەکان بەرەو ئەرەستۆ و ئێرانیەکانیش بەرەو لای ئەفلاتوون ڕۆیشتن.

لە ئێراندا گەڕیانی گواستنەوە لە سیستمی نوێ ئەفلاتوونیەوە بۆ سیستمی ئەفلاتوون بە فەلسەفەی مەلا هادی سەبزواری گەیشتە کۆتایی، لەبەرئەوەی کە ئەم حەکیمە بە ئاشکرا تیۆری "فیض" ڕەتدەکاتەوە و هۆگری چەمکی ئەفلاتوونی حەقیقەت یان حەق بوو، فەلسەفەی سەبزواری هەروەک فەلسەفەکانی سەلەفەکانی خۆی بە تەواوەتی ئاوێتەی ئایینە، لە کۆمەڵگەیەکدا کە زانستە سرووشتیەکان ڕێگەیان نەبێت یان نەکەونە بەر سەرنجی عەقڵانیەتی فەلسەفی لە ئاکامدا هۆگری ئایین دەبێت، لەم کۆمەڵگەیانەدا سەرەتا هۆی سرووشتی واتە کۆی بارودۆخ پێشرەوی دەرکەوتەیەک ئیتر گرنگ نامێنێت و چەمکی هۆی سەرتر لە سرووشت برەو پەیدا دەکات، پاشان هۆی سەرتر لە سرووشت بە شێوازی هۆی ئاییني پەتی واتە 'ئیرادەی دەرکەوتەی" خودا دەردەکەوێت، ڕەنگە هۆی ئاوێتەبوونی فەلسەفەی ئێران لەگەڵ ئاییندا هەربەم هۆیەوە بێت، بەپێی جیهانبینی سەبزواری عەقڵ دوو ڕوخساری هەیە:

١. عەقڵی تیۆری کە بابەتەکەی فەلسەفە و بیرکارییە.

٢. عەقڵی پراکتیکی کە بابەتی ئەوە هونەری بەڕێوەبردنی ماڵ و حاڵ و هونەری سیاسەت و دیکەی بابەتەکانە.

فەلسەفە ناسینێکە سەبارەت بە سەرەتا و ئاکامی شتەکان و نەفس و هەروەها یاسای خودا کە هەمان ئایینە، بۆ ئەوەی لە بنەڕەتی شتەکان تێ بگەین دەبێ نمودە جیاوازەکانی جیهان بخەینە بەر لێکۆڵینەوە، وەها لێکدانەوەیەک ئەوەمان پیشان دەدات کە سێ بنەڕەتی گرنگ بوونیان هەیە:

١. وجوود یان بوون یان نوور.

٢. چییەتی یان نمود یان تاریکایی.

٣. نەبوون یان نابوود یان زوڵمەت.

بوون، رەها و واجبە و چییەتی رێژەییە و ئیمکانی هەیە، بوون لە زاتی خۆیدا خێری رەهایە و ئەم بابەتە کە "بوون، خێری رەهایە" سەلماوە. سەبزواری بە پێوەند دانی کردەوەیی بە حەقیقەت جیهانبینی چەقبەستووی ئەفلاتوونی گۆڕی و بە پەیڕەوکردنی ئەرەستۆ، حەقیقەتی بە خاڵی دەستپێکی راوەستاو و بابەتی گشت حەرەکەکان زانی، لە روانگەی ئەودا گشت بوونەوەرەکانی جیهان عاشقی کەماڵن و بەرەو مەنزڵی نیهایی خۆیان دەڕۆن، جەمادەکان بەرەو بوون بە ڕەوەک، ڕەوەکەکان بەرەو بوون بە حەیوان، حەیوان بەرەو بوون بە مرۆڤ، مرۆڤیش بەپێی پلەی بەرزی خۆی گشت ئەم قۆناغانە لە ناو منداڵدانی دایکی خۆیدا تێپەڕ دەکات.

بزوێنەر یان خاڵی دەستپێکی حەرەکەیە یان بابەتی حەرەکەیە یان هەردووکیانە. لەهەر حاڵەتێکدا بزوێنەر یان دەبێ حەرەکە بکات یان راوەستاو بێت. ئەم بابەتە کە "گشت بزوینەرەکان دەبێ خۆیان ببزوێن" جۆرێک تەسەلسوول دروست دەکات. کەواتە دەبێ بزوینەرێکی ناڕاوەستاو کە سەرچاوە و بابەتی هەموو حەرەکەکان بێت، بوونی هەبێت. حەقیقەت یەکیەتی رەهایە لەبەرئەوەی کە ئەگەر زیاتر لە یەک حەقیقەت بوونی هەبێت هەرکام

لەوانە ئەویدی بەرتەسک دەکاتەوە، حەقیقەت لە باری خاڵی بوونیشەوە ناتوانێت لە یەکێک تێپەڕ بێت لەبەرئەوەی زۆر بوونی خوڵقێنەر دەبێتە هۆی زۆربوونی جیهانی شتەکان. ئەگەر چەند جیهان بوونیان هەبێت لەبەرئەوەی کە هەرکامیان خرن، تەنها لە یەک خاڵدا لەیەکتر دەدەن و هەربۆیە پێویست دەکات لە نێوانیاندا بۆشایی هەبێت و دەزانین وەها بۆشاییەک ئەستەمە، حەقیقەت کە لە زاتی خۆیدا تاقانەیە لە لایەنیکی ترەوە چەند لایەنەیە، بەو واتایە کە حەقیقەت هەمان ژیان و هێز و عەشقە، ئەم وەسفانە دەرکەوتەی زاتی ئەو نین، بەڵکو خودی ئەون و ئەو رێک هەمان ئەو سیفەتانەیە، واتای یەکیەتی حەقیقەت یەکیەتی لەباری ژمارەوە نییە، بەڵکو حەقیقەت یەکگرتنێکە بەدوور لە گشت نیسبەتەکان، سەبزواری بە پێچەوانەی گشت سۆفیەکان و بیرمەندان لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بڕواکردن بە یەکیەت لەگەڵ بڕواکردن بە زۆرینەدا ناسازگار نییە. زۆربوونی هەستپێکراوەکان تەنها بۆ سیفەتەکانی حەقیقەتە، سیفەتەکان روخسارە جیاوازەکانی زانستن و زانست زاتی حەقیقەتە، بەڵام ژمارەکردنی سیفەتەکانی حەقیقەت بەڕاستی ئەستەمە، پێناسەکردنی حەقیقەت بەینابەینییە، ئەگەر بمانەوێ حەقیقەت پێناسە بکەین پێویستە مەقوولەی ژمارە سەبارەت بە حەقیقەت بەکاربهێنین و ئەمەش کردەوەیەکی دروست نییە و لەخۆگری گواستنەوەی بابەتە نیسبەتییەکانە بۆ دەڤەری ئەو بابەتانەی پەیوەندیان پێکەوە نییە، جیهان و هەرچی لەوەدایە سێبەری ناوەکان و بە سیفەتەکانی حەقیقەت یان نووری رەها دەژمێردرێن، جیهان بوونی درێژکراوەیە، کەلام نوورە، وشەی "کن" واتە ببە، زۆربوونی هەستپێکراو لەدایکبووی رووناکبوونەوەی زوڵمەت یان لەدایکبووی بەدیهاتنی نەبوونە، شتەکان پێکەوە جیاوازییان هەیە، ئێمە لە پشت شووشە رەنگاو ڕەنگەکانەوە بەهۆی قاڵبە درێژکراوەکانەوە لێیان دەڕوانین. سەبزواری لە تەئیدکردنەوەی ئیدەی خۆیدا چەند کۆپلەیەک لە جامی دەگێڕێتەوە کە چەمکی "مثل"ی ئەفلاتوون بەوپەڕی جوانیەوە دەنوێنێت:

اعیان همه شیشه‌های گوناگون بود کافتاد در آن پرتو خورشید وجود
هر شیشه که سرخ بود یا زرد و کبود خورشید در او به آنچه او بود، نمود

سەبزواری لە بابەتی دەروو‌ناسییدا لە بنەڕەتەوە پەیڕەوی لە ئیبن سینا کرد، بەڵام دەروو‌ناسی ئەو کامڵتر و ڕێکترە لە دەروونناسیی ئیبن سینا و جۆرەکانی نەفسی بەم شێوەیە پێناسە کردووە:

## نەفس

**ئەلف.** نەفسی ئاسمانی

**ب.** نەفسی زەوینی

١. نەفسی روەکی

٢. نەفسی حەیوانی

٣. نەفسی مرۆیی

**هێزی نەفسی ڕەوەکی**

١. هێزی غاذیە بۆ مانەوەی تاک

٢. هێزی نامیە بۆ کەماڵی تاک

٣. هێزی مولدە بۆ مانەوەی جۆری تاک

**هێزی نەفسی حەیوانی**

١. هەستە ڕەواڵەتیەکان

٢. هەستە ناوەکیەکان

٣. هێزی حەرەکە:

**ئەلف.** حەرەکەی ئیرادی

**ب.** حەرەکەی نائیرادی.

هەستە رواڵەتیەکان چێشتن و لەمسکردن و بۆنکردن و بیستن و بینین، بە پێچەوانەی ئەو شتەی کە زۆر توێژەر باسیان لێکردووە، دەنگ

لە نـاو گوێـدا نیـیە بەڵکـو لەدەرەوەدایە، ئەگەر دەنـگ لە دەرەوەدا نەبێـت، لێکدانەوەی لایەن و دووریەکەی ئەسـتەم دەبێت، هەسـتی بیسـتن لە بینـین نزمترە، بەڵام ئەم دووانە لە دیکەی هەستەکان سەرترن. بۆ سەرتر زانینـی هەستی بینین بەسەر بیستندا چەند هۆیەک دەهێنینەوە:

١. چاو شتە دوورەکان درک دەکات.

٢. چاو وەرگری نوورە کە لە هەموو دەرکەوتەکان سەرترە.

٣. ئەندامی چاو لە ئەندامی گوێچکە پێچهەڵپێچتر و وردترە.

٤. دایکیۆمێنتە بینراوەکـان بـابەتی بـوونن، بەڵام بـابەتە بیستراوەکان لە بابەتی نەبوون دەچن.

## هەستە باتینییەکانیش پێنج دانەن:

١. هێزێـک هەیە بە نـاوی "هەسـتی هـاوبەش"ە، کە لە لەوحـی نەفـس دەچێـت و رێـک وەک سـەرۆک وەزیـرێکە کە بە یـارمەتی پێـنج شـۆفاری خـۆی کە هەسـتە رەواڵەتیەکـانە لە رووداوەکـانی جیهـانی دەرەوە ئاگـادار دەبێتەوە، کاتێ حوکم دەکەین کە ئەم شتە سپییە، شیرینە، حـوکمی ئێمە لە بەڵگەکانی دوو هەستی بینین و چێشتنەوە و هەروەهـا چالاکی هاوبەشـی ئەوانەوە دروست بووە، سپیایەتی لە هەستی بینـین و شـیرینی لە هەسـتی چێشتنەوە دەگرین و بە یارمەتی هەستی هـاوبەش تێدەگەین کە ئەم دوو سفەتە تایبەتن بە شتێکی تاقانەوە، دڵۆپێک کە لەحاڵی وەرینە، وێنـەکردنێک لە هێڵمان پێدەدات لە حاڵێکدا کە چاوی ئێمە تەنها خودی دڵۆپەکە دەبینێت. بێگومان هەستی هاوبەش سەلمێنەری ئەم دەرکەوتەیەیە.[1]

[1] نووسـەر باسـی لە چالاکیەکەی تـری هەسـتی هـاوبەش نەکردووە کە درککردنـی ئیمـاژە خەیاڵاویەکـانە. سـەبزواری سـەبارەت بە هەسـتی هـاوبەش نووسـیویەتی: هێـزێکە کە درک دەکات بە هەستە پێنج دانەکان و وەک ئاوێنە خاوەنی دوو روخسارە. روخسارێکی رواڵەتییە

٢. هێزێــک هەیە بە نــاوی "هێــزی خەیــاڵ" یــان "مــصورە" کە دەســتکەوتەکانی هەســتی هــاوبەش رادەگرێـت، دەســتکەوتەکانی هەســتی هــاوبەش نیگارەکــان یــان وێــنەی شــتە دەرەکیەکــانن هەروەک چــۆن دەســتکەوتەکانی زاکیــرە، گریمــانە و واتاکــانن، ئەگەر ئەم هێــزە نەبێــت حوکمگەلێک وەک ئەوەی کە "سـپیایی و شـیرینی تـایبەتن بە شـتێکی تـاک" مسۆگەر نابێت، هەستی هاوبەش کاتێک دەتوانێت لە نیسبەتی هەڵگیراو بە بـابەتەکە تێبگـات کە نیگارەکـان یـان وێنەکـانی بـابەت و هەڵگیـراوەکە بە ئامێری هێزی خەیاڵ راگیراون.

٣. هێزێک هەیە بە ناوی "هێزی تـرس" کە واتـا بچوکەکان درک دەکـات، بـۆ وێـنە مەڕ بە هـۆی ئەم هێـزەوەیە کە لە دوژمنـایەتی خـۆی و گـورگ تێـدەگات و لێـی هەڵـدێت، هەنـدێ لە گیانلەبەرەکـان لەم هێـزە بێبەشــن، هەروەک چـۆن پەپوولە بێ ئەوەی لە ئـاگر و مەترسـیەکەی تێبگـات خـۆی دەخاتە ناو ئاگرەوە.

٤. هێزێکی تـر "هێـزی زاکیـرەیە" کە دەستکەوتەکانی هێـزی وەهـم واتە ماناکان و گریمانەکان رادەگرێت.

٥. هێزێکــی تــر هەیە بە نــاوی "هێــزی داگیرکــردن" کە دەبێــتە هــۆی تێکەڵبوون و لێکدانەوەی واتاکان، بە هـۆی ئەم هێـزەوەیە کە ئێمە دەگەینە وێناکردنی ئەسپی باڵدار، ئەم هێزە ئەگەر بە رێنمـوونی هێـزی وەهـم کـار بکات و ئەگەر بڕواتە ژێر سوڵتەی عەقڵەوە، دەبێتە فکر.

خــاڵی ســەرتربوونی مــرۆڤ بەســەر گیانلەبەرەکــانی تــردا عەقــڵ یــان نەفسی ئاخاوتنە و عەقڵ زاتی مرۆڤایەتییە، عەقڵ خاوەنی یەکیەتـی حەقیقی و نە یەکیەتــی ژمــارەییە و درکــی بــابەتە گــشتیەکان بە خــۆی و بــابەتە بچووکەکــان بە واســیتەی هەســتە رواڵەتــی و باتنییەکــان دەکــات، عەقــڵ

---

و لە رێگەی هەستەکانەوە درک بەو شتانە دەکات کە هەستی پێدەکرێت. روخساریکیشی رووی لە ناخ و دەروونە و درک بە خەیاڵ و نهێنیەکان دەکات.

سـێبەری نـووری ڕەهــایە و وەک ئەوە خـۆی بە لایەنگەلـی جیـاوازەوە دەردەخــات، بە یەکیەتــی خــۆی زۆریــنە لەخۆدەگرێــت و بەتوانــایە لە وەرگرتنی زۆرینەکاندا، لەگەڵ جەستەدا پەیوەندیەکی زەرووری نییە، کات و شـوێنی نییە و هەربـۆیە تووشـی گۆڕانکـاریی نابێت، لە حـاڵەتی خەودا جەسـتەی مثـالی بەکـار دەبـات و لە ئاگاییـدا سـوود لە جەسـتەی فیزیکـی دەبات و ئەم بابەتە ئەوە پیشان دەدات کە عەقڵ پێویستی بە هیچ کام لەم دوو جەستەیە نییە و بە ویستی خۆی ئەوانە بە کار دەبات، سـەبزواری تیــۆری دۆنــادۆنی ئەفلاتــوونی قبــووڵ نەکــرد و لایەنە جیاوازەکــانی ڕەتکــردەوە، بە بــاوەڕی ئەو، نەفــس نەمــرە و بە کــامڵبوونی بەرەبەرەی هێزەکانی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ سـەرچاوەی سـەرەکی خۆی واتە جیهـانی نووری ڕەها.

## عەقڵ لە ڕێگەی کامڵبوونی خۆیدا
## لە چەند قۆناغ تێدەپەڕێت:

١. عەقڵی هێزەکی
٢. عەقڵی موڵکی
٣. عەقڵی کردەیی
٤. عەقڵی بەهرەمەند
ب. قۆناغەکانی عەقڵی پراکتیکی:
١. پاڵافتنی دەرکەی یان تجلیە
٢. پاڵافتنی ناوەکی یان تخلیە
٣. بەدەستهێنانی پلەی باش یان تحلیە
٤. ڕسکان لە خود و پەیوەندی بە حەق یان فەناوە.

بەم شێوەیە عەقڵ یان نەفسی وتەبێژ پلە بە پلە لە پەیژەی بوون سەردەکەوێت و لە ئاکامدا لە گشتیەتی نووری ڕەهادا، لۆژیک دەبێت و لە نەمری ئەودا نقوم دەبێت، لەم قۆناغەدایە کە نەفسی وتەبێژ هەم هەیە و هەم نییە، بەڵام ئایا نەفسی وتەبێژ لە هەڵبژاردنی ڕێگەدا ئازادە؟ لەم بوارەدا سەبزواری ڕەخنەی لەو هزرخوازانە گرت کە مرۆڤ بە خالقی سەربەخۆی خراپە دەزانن و لە ئاکامدا وتی: هەر شتێک خاوەنی دوو ڕوخسارە: ڕوخساری ڕووناک و ڕوخساری تاریک، هیچ شتێک نییە کە لەم دوو لایەنە بێبەش بێت، خێر لە ڕوخسارە ڕووناکە کە دەبێت و خراپە لە ڕوخسارە تایکەکە، مرۆڤ بەپێی دوو ڕوخسارەکەی خۆی هەم موختارە و هەم مەجبوور.

## ئەنجام

کاتی ئەوە هاتووە کە ئەنجامەکانی باسەکەمان کورت بکەینەوە.

لە بابەتەکانی ئەم وتارە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زەینی ئێرانی لە مێژە لەگەڵ دوو لایەندا واتە لایەنی مغ لە ئێرانی کەون ئارا و لایەنی یۆنانی لە ئێرانی ئیسلامییدا لە دانوستاندا بووە، ئەم دووانە هاوشێوە نین بەڵام بابەتی گرنگ کە هەمان زۆرینەی جیهانە لە هەردوو لایەندا بارودۆخێکی یەکسانی هەیە، بیرمەندانی ئێرانی کەون ئارا بە خوازیارییەکی عەینییەوە جیهانیان پەسەند کرد و هەربۆیە ئەنجامی هەوڵەکانی ئەوان ئایینێکی تاڕادەیەک ماددی لێکەوتەوە، بیرمەندانی کەون ئارا بە روونی لەوە تێگەیشتن کە دەبێ بە روانینێکی گەشەکردووەوە ئاوڕ لە بنەڕەتی سەرەتایی جیهان بدەنەوە، بەم شێوەیە زەردەشت بڕوای بە دوو رۆحی چالاکی بنەڕەتی هەبوو، مانی لە بەرامبەر بنەڕەتی ناچالاکی نووردا، بنەڕەتی دەمارگرژی تاریکایی دانا، بە گشت ئەم باسانەوە لێکدانەوەی ئەوان سەبارەت بە توخمگەلێکی جیاواز کە جیهان پتەو دەکەن زۆر بەرتەسکە، تیۆریەکانی ئەوان بەتایبەت کاتێک باس لە لایەنی نەگۆڕی جیهان دەکەن زۆر ناڕوون و ئاڵۆزە، کەواتە کەموکوڕیەکانی دەزگا فکرییەکانی ئێرانی کەون ئارا دوو لایەنی هەیە:

**١. دووالیزم یان ثنویتی کرچ و کاڵ**

**٢. لاوازیی لێکدانەوە و شیکاریی.**

ئیسلام کەموکوڕیە یەکەمەکەی لابرد و فەلسەفەی یۆنانی خاڵی دووهەمی جێبەجێ کرد، برەو پەیداکردنی ئایینی ئیسلام و موتاڵاکردنی فەلسەفەی یۆنانی فکری ئێرانییان لە رەوتی خۆی لادا کە بەرەو لای

تــاکخوازیی دەرۆی. پاشــان خوازیــارییە عەینیەکەیــان گــۆڕی و رۆحــی خەوتووی زەین خوازییان هەڵساندەوە، کە بە ئایینی یەکەی بوونی هەندێ لە سۆفیەکان گەیشتبووە تەشقی خۆی.

ئەشــعەریەکان نکوڵییــان لە بــوونی مــاددە کــرد و کەوتــنە بــواری گریمانەخوازییەکی تەواو. سۆفیەکان لە بەرامبەر مەشائیەکاندا کە بەئەمەک بوون بۆ چەمکی هەژدیهای مەزنی مامۆستاکەی خۆیان، جیهانی ماددییان بە خوازەیەک یان روخسارێک لە بوونی خودا زانی و باسیان لەوە کرد کە ئەم لایەنە لەبەر پێویستی خودناسی خودایە کە ساز کراوە.

دەکرێ بە متمانەوە باس لەوە بکەین کە زەینی ئێرانی بەدەرکەوتنی گریمانەخوازی ئەشعەری بەسەر دووالیزمی خوا و ماددەدا زاڵ بوو، هەروەها بە هێزی چەمکە فەلسەفیە نوێکان دووالیزمی کەون ئارای نوور - تاریکایی زیندوو کردەوە. شهاب الدین سەهرەوەردی خوازیاری بیندراوی بیرمەندانی کەون ئارا و خوازیاری زەینی حەکیمەکانی ئێرانی کەون ئارای پێکەوە ئاوێتە کرد، دووالیزم زەردەشتی بە شێوەیەکی فەلسەفیتر و رۆحانیتر کردەوە و دەزگایەکی وەهای دارشت کە هەم زەین و هەم عەینی لەبەرچاو گرت، واحد محمود بە چەندخوازیی خۆیەوە لەگەڵ سیستەمە تاکخوازەکاندا بەرەوڕوو بووەوە و باسی لەوە کرد کە واقع زۆرینەیە و یەک نییە، لەبەرئەوەی کە پێکهاتەیەکە لەو یەکە زیندووانەی کە بە رێگەگەلی جیاواز لەگەڵ یەکتردا ئاوێتە دەبن و بەرەبەرە لە پەیژەی دیمەنەکانەوە سەردەکەون. ئەم پەرچەکردارەی واحد محمود زۆر کورت خایەن بوو، لە دوای ئەوە سۆفیەکان و حەکیمەکان هێدی هێدی تیۆری بەهرەمەندبوونی نوێ ئەفلاتوونیەکانیان گۆڕی یان جێیانهێشت کە لەو سەردەمەدا زۆر برەوی هەبوو، بەم شێوەیە بیرمەندانێکیتر پەیدا بوون و لە دەزگای نوێ ئەفلاتوونیەوە روویان کردە فەلسەفەی رەسەنی ئەفلاتوون، فەلسەفەی سەبزواری لەدایکبووی ئەم بزووتنەوە بوو.

# وشەنامەی فەلسەفی

A

| | |
|---|---|
| Absolute | ڕەها |
| Absolutebeing | بوونی ڕەها |
| Absolutedeficicncy | نوقسانی ڕەها |
| Absoluteego | منی ڕەها |
| Absoluteessence | زاتی ڕەها |
| Absoluteexistence | بوونی ڕەها |
| Absolute idealism | ئیدە ئالیسمی ڕەها |
| Absoluteidealist | ئیدە ئالیستی ڕەها |
| Absoluteimperfection | ناتەواویی ڕەها |
| Absoluteimpossibility | سەرپێچی ڕەها |
| Absoluteknowledge | مەعریفەی ڕەها |
| Absolutelaw | یاسای ڕەها |
| Absolutematter | مادەی ڕەها |
| monism Absolute | تاکخوازیی ڕەها |
| Absolutenegation | نەفی ڕەها |
| Absolutenothing | هیچی ڕەها |
| Absoluteoneness | یەکەیی ڕەها |
| Absoluteperfection | کامڵ بوونی ڕەها |
| Absolutephilosophy | فەلسەفەی ڕەها |
| Absolutepossibility | ئیمکانی ڕەها |

| | |
|---|---|
| Absolutereality | حەقیقەتی رەها |
| Absoluteunity | یەکەیی |
| Absoluteviid | بۆشایی رەها |
| Absoluteness | رەهایەتی |
| Abstract | مجرد، انتزاعی |
| Abstractexistence | بوونی ئابستراکت |
| Abstractillumination | نووری ئابستراکت |
| Abstractpossibility | ئیمکانی ئابستراکت |
| Abstraction | ئابستراکت |
| Abstractionism | ئابستراکسیزم |
| Abysmal darkness | تاریکایی |
| Accibent | دەرکەوتە |
| Acquired | دەستکەوتە |
| Acquiredintellect | عقلی دەستکەوتوو |
| Acquisition | دەست کەوتن |
| Act | کردەوە |
| Act ofknowledge | کردەوەی ناسین |
| Act of will | کردەوەی ئیرادە |
| Action | کردەوە |
| Active | چالاک |
| Active being | بوونەوەری چالاک |
| Activeintellect | عەقڵی چالاک |
| Activemind | زەینی چالاک |
| Activism | کردەوە خوازیی |

| | |
|---|---|
| Activist | کردەوەخواز |
| Activity | چالاکی |
| Actual | کردەیی |
| Actualbeing | بوونەوەری کردەیی |
| Actualentity | بوونی کرداریی |
| Actualreason | عەقڵی کرداریی |
| Actuality | کرداریی |
| Aesthete | جوانی ناس |
| Aesthetics | جوانی ناسیی |
| Aethereality | نەرم و نیانی |
| Affirmable | شیاویی سەلماندن |
| Affirmation | سەلماندن |
| Affirmative | ئیجابی |
| Affirmative attribute | وەسفی ئیجابی |
| Agent | چالاک |
| Aggression | توڕەیی |
| Aggressive | توندوتیژ |
| Agnoiologist | جەهل ناس |
| Agnoiology | جەهل ناسیی |
| Agnostic | راوەستاوە |
| Agnostic realism | واقع خوازیی |
| Agnosticism | ئاییني |
| Agnosticist | پەیڕەوی ئاییني |
| All – embracement | دەسەڵاتی رەها |

| | |
|---|---|
| All – embracing | شوێنی ڕەها |
| All – forgiveness | لێبوردەیی ڕەها |
| All – forgiving | لێبوردنی ڕەها |
| All – inclusive | شمولیەتی ڕەها |
| All – inclusiveness | شمولی ڕەها |
| All – knowing | زانای ڕەها |
| All – knowledge | زانستی ڕەها |
| All – merciful | ڕەحمانی ڕەها |
| All– mercy | میهرەبانی ڕەها |
| All– potency | هێزی ڕەها |
| All – potent | دەسەڵاتداری ڕەها |
| All – sustaining | رزقدەری ڕەها |
| All – seeing | بینایی ڕەها |
| All – sustenance | رزقدەریەتی ڕەها |
| All – wisdom | حکمەتی ڕەها |
| All – wise | حەکیمی ڕەها |
| Almightiness | هێزی ڕەها |
| Altruism | ئەویدی پەرەستی |
| An sich | فی‌نفسه |
| Analogy | قیاس |
| Analisis | شیکاری |
| Anarchism | ئانارشیزم |
| Aanrchist | ئانارشیست |
| Angelicreason | عەقڵی فریشتەئاسا |

| | |
|---|---|
| Angelicsoul | نەفسی فریشتە ئاسا |
| Animalkingdom | جیهانی ئاژەڵی |
| Animalsoul | نەفسی ئاژەڵی |
| Animalspirit | رۆحی ئاژەڵی |
| Annihilation | نەبوون |
| AnnihilationinGod | فەنا لە ناو خوادا |
| Anthroposentrism | مرۆڤ تەوەری |
| Anthropocentrist | پەیڕەوی مرۆڤ تەوەری |
| Anthropolatry | مرۆڤناسیی |
| Anthropomorphism | مرۆڤ |
| Anthropomorphist | مرۆڤناس |
| Antinomy | تنازع احکام |
| Anti – rationalism | دژ بە عەقڵ بوون |
| Anti – rationalist | دژە عەقڵ |
| Anti – realism | دژ بە واقیع بوون |
| Anti – rationalist | دژە عەقڵ |
| Anti – realism | دژ بە واقیع بوون |
| Anti –realist | دژە واقیع |
| A posteriori | لە دوای |
| A posteriori demonstration | بورهانی پاشەکی |
| A posteriori reasining | استدلال پاشەکی |
| Apparcnt | پدیدار، نمودار |
| Appcarance | نموود، دەرکەوتە |

| | |
|---|---|
| Applicability | بەکارهێنان |
| Application | کاربرد، اعمال |
| Appearance | نموود، دەرکەوتە |
| Applicabitity | شیاویی بەکردەبوون |
| Application | کاربرد، اعمال |
| Applied | کاربردی، اعمالی |
| A priori | پێشوو |
| A priori demonstration | برهان پێشینی |
| A priori reasoning | استدلال پێشینی |
| Arbitrariness | ئیختیار |
| Arbitrary | ئیختیاریی |
| Archaism | کۆنەخوازیی |
| Archaist | کۆنەخواز |
| Archetype | ئارکیتایپ |
| Argument | موناقەشە |
| Argumentation | احتجاج |
| Aristotelian categories | مەقووله ئەرەستووییەکان |
| Aristotelianism | ئەرەستوو خوازیی |
| Aristotelianist | ئەرەستووخواز |
| Ascending process | پرۆسەی عروج |
| Ascetic | وەک زاهید |
| Asceticism | دژواریی خوازیی |
| Aspect | لایەن و روخسار |
| Assimilation | هاوسان کردن |

| | |
|---|---|
| Astral | امر نجمی، جسم نجمی، روح نجمی |
| Astral body | جسم نجمی |
| Astral spitit | روح نجمی |
| Atheism | ئیلحاد |
| Astheist | مولحید |
| Atom | ناوەک، ئەتۆم |
| Atomism | ناوەکی |
| Attitude | خوازیاریی |
| Attractable | شیاویی راکێشان |
| Attraction | راکێشان |
| Attractive | راکێشەر |
| Attribute | وەسف کردن |
| Attnibute ofaffirmation | وەسفی ئیجابی |
| Attnibute ofnegation | وەسفی سلبی |
| Autodynamic | خود، پویا، درون، پویا |
| Autodynamism | خود، پویایی، درون، پویایی |
| Averroism | ئاییني ئیبنی روشد |
| Averroist | پەیڕەوی ئیبنی روشد |
| Avicennist | ئاییني ئیبنی سینا |
| Aware | ئاگادار |
| Awareness | ئاگاداریی |
| Axiologicrealism | واقعخوازیی بایەخی |
| Axiologicrealist | واقعخوازی بایەخی |
| Axiologist | بایەخ ناس |

| | |
|---|---|
| Axiology | بایەخناسی |
| Axiom | بابەتی باو |
| Axiomaticknowledge | مەعریفەی باو |

B

| | |
|---|---|
| Base | بنەما – بناغە |
| Beast soul | نەفسی ئاژەڵی |
| Becoming | بوون |
| Becomingandperishing | بوون و گەندەڵی |
| Beginnig | سەرەتا |
| Being | بوونەوەر |
| Being and non – being | بوون و نەبوون |
| Belief | بیروباوەڕ |
| Believer | باوەرمەند |
| Berkeleianist | ئاییني بارکلی |
| Blindness | نەخوێندەوار |
| Brahmanism | ئاییني براهمەنیتی |
| Brethren ofpurity | برادەرانی سەفا |
| Buddhism | ئاییني بودا |
| Buddhist | پەیڕەوی بودا |
| By itself | لە خۆیەوە |

C

| | |
|---|---|
| Canon | یاساو ڕێسا |
| Cartesian | دێکارتی |
| Cartesianism | ئاینی دیکارت |
| Casualism | رووداوخوازیی |
| Casualist | رووداوخواز |
| Categorical | پۆلێنکراو |
| Categorical imperative | بابەتی رەها |
| Categories of Aristotle | مەقوولاتی ئەرەستوویی |
| Category | پۆلێن |
| Cctharsis | پالافتن |
| Causal | لە سەربنەمای |
| Causalaction | کردەوەی هۆیی |
| Causlity | هۆیەتی |
| Cause and effect | هۆوهۆکار |
| Cause of causes | هۆی هۆکان |
| Caused | خولقێندراو |
| Causeless | بێ هۆ |
| Celestial circumference | بازنەی |
| Certainty | بنبڕ |
| Chain of causes | زنجیرەی هۆکان |
| Chain of being | زنجیرەی بوون |
| Chance | بەسوتفە |
| Change | گۆڕانکاریی |

| | |
|---|---|
| Changeless | بێ گۆڕان |
| Changeless cause | هۆی بێگۆڕان |
| Chaos | نەخوێندەوار |
| Charisma | کاریزما |
| Charismatic | کاریزماتیک |
| Choice | هەڵبژاردن |
| Christologist | مەسیح ناس |
| Christology | مەسیح ناسی |
| Church | دەزگای ئایینی |
| Circle ofuniverrese | بازنەی بوون |
| Circularmotion | حەرەکەی بازنەیی |
| Circularreasoning | هۆهێنانەوەی بازنەیی |
| Circularregress | دەورەی بازنەیی |
| Circular series | زنجیرەی بازنەیی |
| Clergy | رۆحانیەکان |
| Closed system | سیستمی داخراو |
| Cognition | ناسین |
| Cognitive | ناسینی |
| Collectivism | کۆخوازیی |
| Collectivist | کۆخواز |
| Coming – into – being | بوو بە بوون |
| Coming – into – beingand passing – away | بوون و گەندەڵی |
| Commentary | لێکدانەوە |

